# قوتابخانەی بوداپێست

جۆرج لۆکاچ، سامی نەعیر، فرانسوا ریڤێر، ئاگنش هلێر، و...
وەرگێڕ: هادی محەمەدی

ئەنجومەنی قەڵەمی کوردستانی ئێران

- قوتابخانەی بوداپێست
- جۆرج لوکاچ، سامی نەعیر، فرانسوا ریڤێر، ئاگنش هلێر، و...
- وەرگێڕان: هادی محەمەدی
- تایپ و مونتاژ و دیزاینی بەرگ: ئەسرین ئەسکەندەری
- تیراژ:
- چاپخانە: شڤان
- ژمارەی سپاردن: (541) ی ساڵی2005ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.

سەرچاوە:

مکتب بوداپست
جورج لوکاچ، سامی نعیر، فرانسوا ریویر، اگنش هلر...
مترجم: محمد جعفر پوینده
نشر فکر روز، تهران 1369.

# پێڕست

# پێشەکی وەرگێڕ

ئەندێشەی لوکاچ و قوتابخانەی بوداپێست سەنتزێکی تۆکمە و شیاوە کە بەشێوەی هەمەلایەنە سێ مەکتەبی چەرخی بیستەم پۆزەتیڤیزم، ئیگزیستانسیالیزم و پۆسمۆدێرنیزم دەنرخێنێ و بە دیدێکی کۆنکرێت و هەمەلایەنە سەیری مرۆڤ و کۆمەڵگە دەکا و شرۆڤەیەکی قووڵ و گونجاو ئاراستەدەکات.

جۆرج لوکاچ ساڵی 1885 لە هەنگاریا و لەنێو بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند لەدایك بوو. باوکی سەرۆکی بانك و کەسێکی بەفەرهەنگ بوو. ئەو لوکاچی ناردە زانکۆی بوداپێست تا یاسا بخوێنێ. بەڵام لوکاچ وەك کەسێکی رۆمانتیك و شۆڕشگێڕ لەئاست باوکی سەرکێشی کرد و ئەو بوارەی بەجێهێشت و بواری فەلسەفەی هەڵبژارد. بۆ درێژەدان بە خوێندن ئەویان ناردە زانکۆی هایدلبێرگ، لەوێ لەگەڵ ماکس ڤێبر، گیورگ زیمێل و ئێرنست بلوخ ئاشنا بوو، دواتر لە ژیان و ئەندێشەی **دیلتای** و دەروونناسی **یاسپرس** نزیك بۆوە، ئەمانە دوو لقی بیری فەلسەفی ئاڵمانیا بوون کە لە دژی نیوکانتیزم و پوزەتیڤیزم هەڵوێستیان گرتبوو. ئەندێشەی لوکاچ لە درێژەی ژیانیدا، زۆر گۆڕانی بەسەردا هات، بەڵام سەرتاسەری ژیانی وەك دوژمنی سەرسەختی پۆزەتیڤیزم و ئەمپریزم مایەوە. ساڵی 1910 کتێبی **گیان و فۆرمەکان**ی نووسی، ئەندێشەی تراژیك پێکهاتەی ئەم کتێبە پێناسەدەکات، لەم بەرهەمەدا بیری لوکاچ زیاتر "کانتی"یە و روانگەیەکی نامێژوویی هەیە. لوسیەن گوڵدمەن پێی وایە لە دوا وتاری ئەم کتێبە (**متافیزیکی تراژێدی**)دا بیری لوکاچ لە فەلسەفەی کانت سەرتر دەچێ و لە دیالکتیکی هێگل نزیك دەبێتەوە.

هەر لەم سەروبەندەدا لوکاچ عاشقی "ئیرما سیلدێر" دەبێ، ئیرما ژنێکی جوان و زراڤ و نیگارکێش بوو، لەبەر ئەوەی لە چینی هەژار بوو، باوکی لوکاچ نەیهێشت لەگەڵ کوڕەکەی زەماوەند بکات. ئەڵبەت لوکاچ لەگەڵ ئیرما پێوەندی جەستەیی نەبوو، ئەو خوازیاری ژیانی هاوبەش نەبوو، ئەو ژنهێنانی بە "شێوازێکی لەبرەوکەوتووی بورژوازی" دەزانی. لوکاچ، ئیرمای بە بوونەوەرێکی ئایدیال و خەوناوی دەزانی و دەیوت، ئیرما وەك فەلسەفە وایە دەستی پێ راناگا و دەستەمۆ ناکرێ، ئەو زیاتر ئیرمای بۆ فەلسەفە دەویست، عشقی ئەو، ئەوینێکی ئەفلاتوونی بوو، لە پێوەندی جەستەیی بەدوور بوو. ساڵی 1911 بە چەند هۆیەکی نادیار ئیرما خۆی دەکوژێ و ئاشقەکەی تا دەرگانەی مەرگ دەبات، لە دوای ئەم کارەساتە لوکاچ نووسی: **لەمە بەدوا ئیتر من ناژیم بەڵکوو تەنیا کاردەکەم.** هەر وەها جارێك ویستی خۆی بکوژێ، بەڵام پلانەکەی نەیگرت، دیسان لە بیرەوەرییەکانیا نووسی: من ئیتر هیچ سامانێکم نییە، بێجگە لە هەوڵێکی فەلسەفی. ئەو بەردەوام لە خۆی دەیپرسی: "بۆچی لەپاش ئیرما، من هێشتا زیندووم؟" *بەڵام وەکوو هەموو ئەزموونەکان ئەم کارەساتەش تێپەڕی، لوکاچ زیندوو مایەوە، ژنی هێنا، چووە نێو شۆڕشەوە، شەیدای سۆسیالیزم بوو، دوورخرایەوە، قوتابخانەی بوداپێستی دامەزراند، ساڵگارێك بە رێز و حورمەتەوە ژیا، کاتێکیش لە ساڵی 1971دا ماڵئاوایی لە ژیان کرد، بۆ لاوانی ئەورووپایی پێغەمبەری مارکسیزمی رۆژئاوایی بوو.*

ساڵی 1916 کتێبی **تیۆری رۆمان**ی نووسی، لەم کتێبەدا ئەندێشەی لوکاچ هێگلییە و بە مێتۆدی دیالکتیکی– مێژوویی، سەیری دنیا و مرۆڤ دەکات. وردبینی لوکاچ لەم بەرهەمەدا تا ڕادەیەکە، کە لە دوا وتاردا و، لە توژینەوەیەك لەسەر بەرهەمەکانی تۆلستۆی و داستایۆڤسکی، سەرەتاکانی شۆڕشی ئۆکتۆبر پێشبینی دەکات.

ساڵی 1923 كتێبی **مێژوو و وشیاری چینایەتی** دەنووسێ و لە مێژووی فەلسەفە و ئەندێشەی ئینسانیدا وەرچەرخانێكی گەورە دەخولقێنێ. *ئەم كتێبە بەپێی ئەندێشەی ماركس نووسراوە و سەرەڕای شرۆڤەی قووڵی مێژوویی، ئابووری، سیاسی، فەرهەنگی، پڕاوپڕیشە لە چەمك و مانای تازەی جوانیناسانە، مەعریفەناسانە و مێتۆدناسانە. ئەم كتێبە بەخێرایی دەبێتە هەوێن و چاوگەی زۆربەی بیرمەندانی چەرخی بیستەم و بێجگە لە ماركووزە، ئادورنۆ، هۆركهایمر و لوسیەن گوڵدمەن، تەنانەت كاردەكاتە سەر مارتین هایدگر و ژان پول سارتریش.* لوسیەن گوڵدمەن بە كەشفی ئەم كتێبە و بە ناسینی جۆرج لوكاچ، بوارێك بەناوی كۆمەڵناسی ئەدەبی و قوتابخانەیەكی نوێ دادەمەزرێنێ.

*لوكاچ ساڵگارێكی درێژ تێكەڵ بە سۆسیالیزمی سۆڤیەت بوو و لەو وڵاتە ژیانی بردەسەر، ئەو بە فكر و مێتۆدەكانی دژی دەسەڵاتی ستالین و ستالینیزم بوو، بەڵام ئەوەندەش زیرەك بوو كە توانی لەئاست پاكتاوكردنەكانی ستالیندا رزگاری بێ و ساڵانێكیتر بمێنێتەوە و چەندین بەرهەمی تر بخولقێنێ و فەلسەفەی خۆی بنووسێتەوە.*

هۆكاری رۆڵی گرنگی لوكاچ و كاریگەری قووڵی بەرهەمەكانی ئەو لە فرەڕەهەندی بوونی ئەندێشەكانی ئەو دایە، *لوكاچ جگە لەوەی لە زانكۆی هایدلبێرگ هاوكار و دۆستی نزیكی ماكس ڤێبر، زیمێل و بلوخ بوو، لەگەڵ پێكهاتەی فكری فەلسەفی جوانیناسانەی كانت و هێگل ئاشنابوو. چەند ساڵێك دواتر، كاتێ كە تیكەڵ بە ئەندێشەی ماركسیستی بوو پێكهاتەی فكری كانت و هێگلی تێكەڵ بە دیالكتیكی ماركسیستی كرد و چەندین بەرهەمی ستاتیكی، مێتۆدۆلۆژیكی، فەلسەفی و ئەدەبی بەوردی نووسییەوە. جگە لەمەش لوكاچ تێكەڵ بە شۆڕشی جەماوەری سەدەی بیستەم بوو، دنیای پراتیكی بە هەست و ئەزموون و دەركی خۆی*

*تاقیکردەوە، ئەزموونەکانی ئەم کارەش لە پێکهاتەی ئەندێشەی ئەودا ڕەنگدانەوەی بەرینی هەبوو.*

ئەم کتێبەی بەردەستان پێناسەیەکی کورتە لە قوتابخانەی بوداپێست و شاگردەکانی لوکاچ. کەوابوو، بۆ ئاشنابوون لەگەڵ دنیای بەرینی فەلسەفی لوکاچ نابێ هەر بەم کتێبە واز بێنین، دواوتاری ئەم کتێبە، بابەتێك بوو بەناوی "محاكمەی هاراستی"، کە زیاتر باسی نەبوونی ئازادی لە هەنگاریای ئەو سەردەمەدا دەکرد، ئێمە لەجیاتی ئەو وتارە، وتارێکی لوکاچ مان لە سەرچاوەیەکی ترەوە هەڵبژاردووە و لەم کتێبەدا هێناومانە: **فەرهەنگی کۆن و فەرهەنگی نوێ**، ئەمە بابەتێکی گرنگە کە ڕوانگەی هیۆمانیستی لوکاچ لەسەر چەمکی فەرهەنگ و باڵادەستی فەرهەنگی ئینسانی لەئاست ئابووری گەڵاڵە و ئاراستە دەکات.

لە پەرداخکردنی زمانی وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا تێکۆشاوین زمانێکی ڕەوان و پاراو بدەینەدەستەوە. بێگومان هەر دەقێکی فەلسەفیش پێویستی بە قووڵبوونەوەو چەند جار خوێندنەوە هەیە.

لە کۆتاییدا دەبێ بڵێم بۆ ناساندنی فەلسەفەی لوکاچ و قوتابخانەی فکری ئەو، بێجگە لەم کتێبە، بەرهەمیکیتر بەناوی "فەلسەفە و مێتۆد" هەر ئێستا ئامادەی چاپە و وەرگێڕانی چەند بەرهەمێکیتریشمان بەدەستەوەیە. بەو هێوایە سوژەی کوردیش ببێتە خاوەن فەلسەفە و مێتۆد، و زمانی کوردیش ئەوەندە گەشەبکات کە بشێ فەلسەفەی پێ بنووسی.

**هادی محەمەدی**

سەرچاوەی ئەم پێشەکییە:

1 **جامعە، فرهنگ، ادبیات**، ل. گلدمن، **جعفر پوینده**، **نشر چشمە**.

2 **نظریە رمان، ج. لوکاچ**، **حسن مرتضوی**، صص. 154 **تا** 166.

# قوتابخانەی بوداپێست

## سامی نەعیر

**ئەم وتارە وەرگێڕدراوی بابەتێکە کە سامی نەعیر ( Sami Nair) بیرمەندی هاوچەرخی فەرانسی لە ناساندنی قوتابخانەی بوداپێستدا بۆ (Dictionare critique du marxisme) نووسیویە. ئەم فەرهەنگە بە هاوکاری 85 کەس لە مامۆستایانی ناوداری فەلسەفە و زانستی مرۆڤی نووسراوە و بێگومان یەکێ لە گرنگترین و بڕواپێکراوترین سەرچاوەی زانستی و ئاکادیمیکە کە مارکسیزم دەناسێنێ و دەینرخێنێ. سەنتەری پەخشی زانستگەیی فەرانسە (P.U.F) بۆ دووهەمین جار ساڵی 1985 ئەم فەرهەنگەی چاپ کردووە.**

*"من بە بڕوای قووڵ گەیشتووم کە هەر ئێستا و لەنێو ئەم بەرهەمانە دایە کە فەلسەفەی داهاتوو دەرسکێ و دەپشکوێ"*. جۆرج لوکاچ[1] ساڵی 1971 لە نامەیەکدا کە بۆ گۆڤاری Times Literary Supplement نووسیویە، بەم دێڕە بەرهەمەکانی ئاگنش هلێر[2]، فرنس فێهر[3]، جۆرج مارکوش[4]، میهای وایدا[5]، دەناسێنێ و، بە پێدانی ناوی "قوتابخانەی بوداپێست"[6] پرستیژیان پێدەبەخشێ. بەڵام دەبێ ناوی ئەم بیرمەند و کۆمەڵناس و سیاسەتزان و نووسەرانەی خوارەوەش لەسەر ئەو لیستەی

[1] Georges Lukacs.
[2] Agnes Heller.
[3] Ferenc Feher.
[4] Gyorgy Markus.
[5] Mihaly Vajda.
[6] Ecole de Budapest.

لوکاچ زیاد بکەین: ئاندراش هگدوش[7]، ماریامارکوش[8]، جۆرج بنتس[9]، یانوش کیش[10]، شاندور ڕادنوتی[11]، جۆرج کۆنراد[12] و چەند کەسێکیتر. ئەم قوتابخانەیە هەرچەند بەرهەمەکانی لوکاچی لاو بەر لە سەردەمی ستالین (**گیان و فۆرمەکان**[13]، تا **مێژوو وشیاری چینایەتی**[14]) و پاش ستالین (**دوایین جوانیناسی**[15] و **بووناسی وجودی کۆمەلایەتی**[16]) بە خەستی کاری تێکردووە، بەلام تەنیا بە کارتێکردنی لوکاچ کورت نابێتەوە. لێرەدا باسکردن لە قوتابخانەی بوداپێست، پێشاندەری ئاخێز و بوژانەوەیەکی راستینە کە بەوپەری وردبینیەوە لە سۆڤیەت و ئەورووپای رۆژهەلاتدا مارکسیزم دەژێنێتەوە و گەندەلییەکانی ستالینیزمی لێدەسرێتەوە.[17] ئەم قوتابخانەیە هەرچەند لە سەرەتای بەرنامەکانیدا گونجاوییەکی[18] رێژەیی پیشان ئەدا – ژیاندنەوەی ئەندێشەی مارکسیستی، گەیشتن بە جێگایەکی گرنگ لە بواری ئایدیۆلۆژیکیدا، دەرخستنی ئەو هێزە کۆمەلایەتییانەی کە دەیانەوەێ لە هەنگاریادا ئالوگۆری دیموکراتیك بەدیبێنن– بەلام گەشەی ئەو لە 1956تا 1978، لە ئاست چەندین هەلوێست و ناکۆکی ناوخۆیی و پچڕانی (شەخسی و ئایدیۆلۆژیك) و سەرئەنجام جیایی بەرەورِوو بووە. ئەمڕۆ لە پاشماوەکانی ئەم بزاڤە بەرینەی چەپی نوێی هەنگاریا دەتوانین سێ رەوتی جیاواز لێك جیابکەینەوە:

[7] Andreas Hegedus.
[8] Maria Markus.
[9] Gyorgy Bence.
[10] Janos Kis.
[11] Sandor Radnoti.
[12] Gyorgy Konrad.
[13] Lame et Les Formes.
[14] Histoire et conscience de classe.
[15] Esthetique.
[16] L ontology de letre social.
[17] Destalinisation,
[18] Coherence.

1. ڕەوتێك کە فرێنس فێهر، ئاگنش هلێر، جۆرج کونراد و ماریا مـارکوش (دوورخراوانـــی بـــەدڵخواز بـــۆ ئۆســـترالیا) نوێنەرایـــەتی دەکـــەن. بەرهەمــەکانی ئەمانــە تێکــڕای پانتــایی زانســتی مرۆڤــی (فەلســەفە، کۆمەڵناســـی، جوانیناســـی، دیمـــوگرافی و ئیپیســـتمۆلۆژی و هتـــد) دەگرێتـــەوە. تایبەتمەندییـــە بەرچـــاوەکانی ئـــەم ڕەوتـــە بـــریتین لـــە: داهێنـــانی فکـــری شـــاز، پچـــڕانی لێبڕاوانـــە لـــە سۆســـیالیزمی ســـەردەم، ڕەخنەی قووڵ و بنەڕەتی لە مارکسیزم.
2. ڕەوتێك کە ئەمڕۆ ئاندراش هگدوش ڕێبەڕی دەکات. هگدوش خەبات بۆ چاکســازی و ڕەخنــەی قــووڵ لــە سیســتمی دەســەڵاتدار بەپێویســت دەزانێ. ئەم بزاڤە بە "چاکسازی کۆمۆنیزم" ناسراوە.
3. ڕەوتی جۆرج بنتس و یانوش کیش کە بەگشتی لە مارکسـیزم و کـاری تیـۆری دەسـتی هـەڵگرتووە و ئـەمڕۆ گرنگـی زۆر بـە ڕۆژنامەنووسـی سیاسی لە باڵی ئۆپۆزیسیۆندا دەدات.

بێگومـان ئـەم تایبەتمەندییـە سـادە و سـاکارانە نـاتوانێ ڕەنگدانـەوەی ڕەهەنـدەکانی ئـەم قوتابخانەیـە ڕۆشـن بکاتـەوە، بـەڵام لانیکـەم دەرکـی ناکۆکییـە بنەماییـەکانی هـەمواردەکات... بـەڵام لـە بـواری نووسـین و بلاوکردنـەوەدا، ڕەوتـی ئۆسـترالیا لـەوانیتر دەوڵەمەنـدترە. دەرکـی هەڵوێسـتی تیـۆری – سیاسـی ئـەوان بـەهۆی فرەڕەهەنـدی و گـۆڕانی بـە خێرایـی و ئـاڵۆزی بەرهەمـەکانیان، زۆر دژوارە. دوایـن بەرهـەمی کـۆیی ئەوان، **دیکتاتۆری بەسەر نیازەکاندا**[19] (1983) هەڵوێسـتی تازەیـان پیشـان ئەدا و لەراستیدا توێژینـەوەی هەمەلایەنـەی سیسـتمی جـۆری سـۆڤیەت و خـودی ئەندێشـەی مارکسیسـتی ئاراسـتەدەکات. ئەندێشـەی ناوەنـدی و بنەماسازی ئەم بەرهەمە بریتییە لە:

[19] Dictatorship over Needs.

– له پلەی یەکەمدا، پێوەندی دووبارەیـه لەگـەڵ هیۆمـانیزمی بنـەڕەتی[20] کە بێجگە لەوەی پانتایەکی گرنگ لە ئەندێشەی مارکس دەسازێ، بـەڵکوو هـەروەها و بەتایبـەتی، تاقـە وەڵامـی شـیاوە بـە کـاری دژەئینسـانی[21] سەردەمی ستالین. ئەم دۆکترینـە مرۆڤدۆسـتانە، ئاخێزگـەی سـەرهەڵدانی جۆرێـك فەلسـەفەی بەخۆداهاتنـەوە[22]یـە کـە بەرهەمـەکانی ئـاگنش هلێـر نموونەی بەرجەستەی ئەوە.

– لـە پلـەی دووەهەمـدا، سـەرلەنوێ لەسـەر فەلسـەفەی کـردار[23] و یەکخسـتنی لەگـەڵ تیـۆری پێداگری دەکا و لەئاست هـەموو شـێوەکانی پـۆزەتیڤیزم رادەوەسـتێ. ئەگـەر ئـەم یەکخسـتنەوەیە بـەمانای رەتکردنـەوەی هەمەلایەنـەی "مارکسـیزمی رەسمـی" وڵاتـانی رۆژهەڵاتـە، ئەگـەر دۆسـتایەتی لەگـەڵ مارکسیسـتی رۆژاوایـی دەکاتـە بنـەما، لەگـەڵ مرلو– پۆنتی[24] و لوسیەن گوڵدمەن[25] یەکدەگرێت و لەئاست ئاڵتوسـێر[26] رادەوەستێ کە بەرهەمەکانی لە یەك کاتدا وەك جۆرێك نیۆ- پۆزەتیڤیزم[27] و تەنانەت مارکسیزمی رەسمی دەردەکەوێ.

– له پلەی سێهەمدا، لەگـەڵ چـەپی نـوێی رۆژاوا هاوپشـتی دەکا و لـە نرخاندنی کۆمەڵگەی مەسرەفیدا لـە هـەوڵی رێکخسـتنی تـازەی سیسـتمی نیازەکان دایە. هەر وەها بە رەخنەی توند لە وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات، خوازیاری بەرینبوونەوەی ئازادییە سیاسییەکانە.

---

[20] Humanisme radical.
[21] Deshumanisation.
[22] Desalienation.
[23] Philosophie de La Praxis.
[24] Merleau-ponty.
[25] Lucien Goldmann.
[26] Althusser.
[27] Neo-Positivisme.

– سەرئەنجام، وردبینی لەمەڕ دەرفەتی جۆرێ دیموکراسی ریشەیی، لەسەر بنەمای فرەچەشنی[28]، پرستیژی سەرلەنوێی[29] بازاڕ، خۆڕاپەڕاندن[30] و کۆمەڵایەتیکردنی[31] سەربەستی مناسباتی بەرهەمهێنان.

ئەم تێزانە لە راستیدا لە هەموو بەرهەمە تاکی و گرووپییەکانی ئەم رەوتەدا دەبیندرێ. بەڵام بێ شك لە کتێبی **دیکتاتۆری بەسەر نیازەکاندا** بە وردی و شەفافی ئاراستەکراوە. ئەم بەرهەمە لە هەمان حاڵدا کە بەشێوەی هێمایی بانگەشەی مارکسیزم دەکا، لێبڕاوانە لە ئەزموونی سوسیالیزمی سەردەم دەپچڕێ. تەنانەت دەکرێ بڵێین ئەم نووسەرانە بنەماکانی مارکسیزمیان لە بەرهەمەکانی مارکسی لاو هەڵێنجاوە، هەر ئەمەش بزوێنەری پچڕان لە سۆڤیەت بووە.

بەرای ئەم نووسەرانە، روانگەی مرۆڤناسانەی مارکسی لاو لەمەڕ سروشتی مرۆڤ، ئەوجۆرەی کە مارکسی لاو بەیانی کردووە، لەسەر خەیاڵاتی میتافیزیکی دانەڕێژراوە، بەڵکوو یەکسەر لەسەر دنیای نیازەکان راوەستاوە. ئەم هۆکارەش بایەخێکی تەواو بوونناسانەی[32] هەیە و: پیشاندەری گوزەری مێژوویی و کۆمەڵایەتی مرۆڤی سروشتییە بەرەو مرۆڤی فەرهەنگی. کەوابوو، مرۆڤێتی لە وجودی مرۆڤدا، گەشەی ئازادی تواناکانی ئەو لە رێگەی رێکخستنی سیستمێکی تایبەت لە نیازەکان وەك پێویستی دەردەخات. ئەگەر سۆسیالیزم بەمانای وەدیهاتنی ئازادی نیازەکان، لە رێگەی گەشەی تاکێتی ئازاد و بەهەمان رادە بەرپرس بێت، هەر وەها ئەگەر لێمان رۆشن بێت کە سیستمی نیازەکان لە کۆمەڵگای

[28] Pluralisme.
[29] Rehabilitation.
[30] Auto-gestion.
[31] Socialisation.
[32] Ontologique.

بورژوازیدا، بەتەواوی تووشی گەندەڵی و لەخۆنامۆیی هاتوون، سەرئەنجام و بەناچار دەبێ قەبوڵ بکەین کە سۆسیالیزمی سەردەم پیشاندەری نرخاندنی حەتمی (بەمانای هێگلی) بەرنامەی مارکس و لە هەمان حاڵدا، وەرگرتنی لایەنە باشەکانی سیستمی بورژوازی نیازەکانە. یان بە وتەیەکی رۆشنتر کارکردی نیازەکان لە سۆسیالیزمی باودا بەتەواوی دژ بەخۆی بۆتەوە. بە وتەی یوهان ئارناسون (Johann Arnasson) یەکێ لە باشترین راپۆرت نووسانی ئەم رەوتە) وەك " رێگەچارەی[33] فۆرمێکی تا ئەمرۆ نەناسراوی دەسەڵاتی لێهاتووە".[34] ئەم ئاوەژووبوونەوە، سەرئەنجام، نیشانەی وەدیهاتنی نیازەکان نییە، بەڵکوو هەمان دیکتاتۆری لەسەر نیازەکانە. ئەم دیکتاتۆرییە هەمووبەستێنەکانی سیستمی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە و دەکرێ ئاوا پێناسەی بکەین: سیستمی دەسەڵاتێکی هەمەلایەنە کە لەودا، داگیرکردنی زێدەبایی کۆمەڵایەتی لەلایەن دەزگای حکومەتەوە فۆرمێکی تایبەت لە خاوەنداریێتی پاوانخوازانە[35] بەسەر کۆمەڵدا دەسەپێنێ و هەموو کۆمەڵگا پێبەش دەکات. بەرای ئەم نووسەرانە، ئەم کارە، پێکهاتەیەکی[36] تازە لە مناسباتی تاك-کۆمەڵگایە، کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی تاکێکی سەرکز و تێکشکاو و پرۆسەیەکی مێژوویی دژەرۆشنگەری[37]، یانی دژە ئازادی[38] و سەرئەنجام، دەسەڵاتێکی دیسپۆتیزمی گشتگیر[39] دروست دەکا کە

---

[33] Modus operandi
[34] Perspectives and problem of Critical Marxisme in Eastern Europe, in Thesis Eleven, n 5-6, 1982.
[35] Expropriation monopoliste.
[36] Structuration.
[37] De-enlightenment.
[38] Contre-emancipation.
[39] Totalitarisme.

دەیەویٚ تێکڕای کۆمەڵگا یەکدەست و هاوشێوە بکات. ئەم سازوکارە بەرفراوانە کە ئەمڕۆ تووشی قەیران هاتووە، هەر لە سەرەتای شۆڕشی 1917وە، ئەڵبەت بەشێوەی قەیراناوی لەئارادا بووە. ستالینیزم، کە بەڕای ئەم نووسەرانە، سەرکەوتنی لێنینیزم بەسەر هەموو کۆمەڵگەدا بوو، بێجگە لە بە ئەنجام گەیاندنی بەرئەنجامە لۆژیکییە تایبەتەکانی بۆلشڤیزم و بەتایبەت پارتی سیاسی لێنینیستی کارێکیتری نەکردووە. بەڕای ئەم نووسەرانە، دەکریٚ ئەم فاکتە مێژووییە تازەیە لە سیٚ بواری ئابووری، سیاسی و ئایدیۆلۆژیکیدا، کە کۆمەڵگەی جۆری سۆڤیەت پێکدێنیٚ، ببینین:

لە بواری ئابووریدا دیکتاتۆری لەسەر نیازەکان، لەنێو سیستمی بەرهەمهێنانی هەرەوەزیدا بەشێوەی ناسەرمایەداری ڕۆڵ دەبینیٚ و پیشاندەری فۆرمێکی نویٚ لە داگیرکردنی [دەوڵەتی] زێدەبایی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتییە. ئەم سیستمە، سەرمایەداری نییە– بەڵکوو ڕەنگە لە یەك کاتدا پێش سەرمایەداری و پاش سەرمایەداری بێت– چونکە ئابوورییەکەی پێڕەوی ئەقڵانیەت پەرێزی[40] سروشتی و بنەمایی نییە: پلان و بەرنامەکان، بەپێچەوانەی ڕواڵەتیان، بەرهەمی گەشەی لۆژیکیی ئابووری نیە، بەڵکوو ئاکامی سیستمی یەکپارچە لە داخوازییە پێویستەکان[41]، یانی کۆمەڵێك لە زەخت و گوشارەکانە کە پیشاندەری هاوکاتی مشت و مڕ[42] و ڕکەبەرایەتی توند و تیژی گرووپی جۆراوجۆری نێوخۆییە کە لە جەرگەی ئەم سیستمە دان. کەوابوو، زیاتر، ئابوورییەکی داواکراو مەبەستە نە ئابووری سیاسی. بەتایبەت بەمبۆنەوەیە کە گوزەر لە هەرێمی خولقاندنی ئامێری بەرهەمهێنانەوە بۆ هەرێمی بەرهەمهێنانی

[40] Irrationalite substantille.
[41] Binding orders.
[42] Bargaining.

ئامێرەکانی بەکارهێنان ئیمکانی نییە. تەنیا بەشی بەرهەمهێنانی چەك و چۆڵی سەربازی لەم یاسایە بەدەرە، ئەمەش بەهۆی بەرگری و پاراستنی دەسەلآت و فرۆشتنی بە ولآتانی جیهانی سێهەمە. بەرئەنجامی تەوەری ئەم دۆخە لە بواری نیازەکاندا ئاوایە: لەم سیستەمەدا نیازە کۆمەلآیەتییەکان دەستەبەر ناکرێن، مەگەر ئەوە کە بەشێوەی ئامانجی بروکراتیك بەیان بکرێن ... ئاکامی ئەم ڕەوتەش، تایبەتمەندییەکە کە بە زەقی نائەقلآنیبوونی ئەم سیستەمە پیشان ئەدات: هەڵداچوونی بەردەوامی قات و قڕی و مەسرەفی زیادی...

لە بواری سیاسیدا، ئەم سیستەمە بە هەلوەشاندنەوەی هەرجۆرە سنوورێکی نێوان دەولەت و کۆمەلگەی مەدەنی[43] دەردەکەوێت. ئەم نووسەرانە پێیان وایە کە لە سالی 1917 بەملاوە، هەموو کاروباری کۆمەلگا سیاسی کراوەتەوە و حیزب وەك هێمای فۆرمێکی نوێ لە دەسەلآتداری دزەدەکاتە گشت سوچ و قوژبنێکی کۆمەلگا و پێکهاتەی بەرژەوەندی تایبەتی و کۆمەلآیەتی بەوپەڕی دۆگماتیزمەوە دیاری دەکات. حیزب بەمجۆرە، بەشێوەیەکی سەرەڕۆیانە بەرژەوەندی گشتی بەرجەستە دەکات. بەلآم حیزب، خەیالێ نییە: توێژی ئلیتانی دەسەلآتدار[44]، تێکەلێك لە دام و دەزگای بەرزی سیاسی کە ئەرتەش و ڕیکخراوی پۆلیسی– تەناهی دەگرێتەوە، پیشاندەری حیزبە. ئەم توێژە ئلیتە حیزب نییە: بەلکوو لە پێگەی هێزێکی برواپێکراودا نوێنەرایەتی حیزب دەکا و پیشاندەری بەرژەوەندی حیزبە کە نە بە بەرژەوەندی یەکە یەکەی ئەندامانی کزدەبێت و نە بە بەرژەوەندی ئەم توێژە ئلیتە. حیزب سیستمێکی تۆکمەیە کە لۆژیکی تایبەت بەخۆی هەیە. هەر بەمهۆیە، لەمەڕ ئەم جڤاتانە، ناکرێ باسی چینی دەسەلآتدار بکەین. بروکراسی[45] و

[43] Societe civile.
[44] Elite dirigeante.
[45] Bureaucratie.

تکنۆکراسی[46] دوو ئامێرن کە دەسەڵاتی هەقیقی حیزب دەچەسپێنن. نووسەران لەمەڕ ئەم پرسە، گەلێ تێبینی قووڵ و بەرینیان ئاراستەکردووە کە بەشێوەی جۆراوجۆر پاساودان و پێشێلکاری مافی مرۆڤ لە سۆڤیەت و ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا پیشان ئەدەن. سەرەڕای ئەمەش، ئەم فۆرمە دەسەلاتدارییە تازەیە بە مەبەستی هاوشێوەکردنی هەموو کۆمەڵگە بە یارمەتی زەختی بەردەوام لەسەر سیستمی نیازە کۆمەڵایەتییەکان، بە هەمان رادە کە لە لیبرالیزم و پەیمان و یاساکانی[47] کۆمەڵگەی بوژوازی دوورە، لە فۆرمی دەسەڵاتی سیاسی پێش بورژوازی و، لە دەسەڵاتی دیسپۆتیك نزیکە.

لە بواری ئایدیۆلۆژیشدا دیکتاتۆری لەسەر نیازەکان بەتەواوی ئاشکرایە. ئایدیۆلۆژی، لە پێکهاتەی خۆیدا، بەرهەمی ململانێ لە بازاڕی کولتوری دایە، بەڵام لە ناخی سیستمی جۆری سۆڤیەتدا لە شکڵی دەرسێکی زۆرەملی ناو و ناتۆر هەڵدەبەستندا دەردەکەوێ کە دەیەوێ هەموو ئاکار و رەفتارێکی کۆمەڵایەتی کۆنترۆڵ بکا [و کۆمەڵێکی سەرکز و دەستەمۆ بخولقێنێ]. لەئاکامدا، خودی چەمکی ئایدیۆلۆژی، تووشی ئاوەژووبوونەوەی پێهاتەیی دەبێت: پاوانخوازی ئایدیۆلۆژیکی، بە سڕینەوەی هەرجۆرە پێشبڕکێیەك لەنێو بازاڕی ئەندێشەکاندا، ئایدیۆلۆژی وەك یاسای خۆسەلمێنی[48] سیستمی دەسەڵاتداریی لێدەکا و ئەم پرۆسەیە، کاریگەرییەکی کولتوری ئێجگار نالەباری لێدەکەوێتەوە: *بەتایبەت، بێدەرەتانی فەرهەنگی خودی سیستم کە رێگەی هەرچەشنە دەرکەوتنێکی فەرهەنگی [سەربەخۆ] ی کۆمەڵگا بەربەست دەکا، پرۆسەی مێژوویی دژی ئازادی و دژەرۆشنگەری کە لە جیاتی بەرپرسایەتی، تاکی تەسلیم و لەخۆنامۆیی[49]، جێگیر دەکات، گەشەی*

[46] Technocratie.
[47] Contractualisme Juridique.
[48] Auto-affirmative.
[49] Alienation.

*دەروونپشێوی کۆمەڵایەتی کە لە شکڵ و شێوەی تایبەتی ترس و دڵەخورپەدا دەردەکەوێ، پەراکەندەیی ئەتۆم ئاسای کۆمەڵایەتی و هەروەها فۆرمە تایبەتەکانی داڕزینی مێشك و دەماری جەماوەر و هتاد.*

بەڕای ئەم نووسەرانە، سیستمی دیکتاتۆری لەسەر نیازەکان ئەمڕۆ تووشی قەیران هاتووە. ئەم قەیرانە، بەرهەمی چەند هۆکارێکە:

1. نەبوونی دەسەڵاتی فەرهەنگی واقعی و دەسەڵاتداری (حیزب) بەسەر کۆمەلگەدا: ئایدیۆلۆژی رەسمی ناتوانێ وڵامی نیازی تێکۆشان و مەسرەفی فەرهەنگی خەڵکی کۆمەڵگای بلوکی رۆژهەلات بداتەوە.

2. بوژانەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی (بەتایبەت لە پۆلۆنیا و هەنگاریا) کە بەرای ئەم نووسەرانە بەرەو جیابوونەوە لە دەسەڵاتی بلوکی سۆڤیەت دەچن.

3. قەیرانی ئابووری نموونەی گەشەی سفر، کە توانای چارەسەری پرسی زەمینەکان و پرسی ئامێرەکانی مەسرەفی نییە.

4. سەرهەڵدانی جۆرێکی تازە لە نارەزایەتی فەرهەنگی کە فەندمەنتالیزمی[50] ئایینی چەند ناوچەیەك لە خەڵکی پۆلۆنیا و سولژنیتسین نموونەی بەرجەستەی ئەوە. لە ڕوانگەی نووسەرانی ئەم قوتابخانەیەدا، ئەم دواخالە زۆر قەیراناوییە، چونکە بەڕای ئەوان "ژەهری" بونیادگەرایی، بەڕادەی دیکتاتۆری لەسەر نیازەکان کۆنەپەرستانە و دژی پێشکەوتنە.

خالێکی رەخنەیی: سەرەڕای گرنگی کتێبی **دیکتاتۆری بەسەر نیازەکاندا** و سەرەڕای رەسەنبوونی ئەندێشەی هەرکام لە نووسەرانی ئەم قوتابخانەیە، چەند خالێکی رەخنەگرانە بەپێویست دەزانین:

ئەلف) دەرخستنی مژاری نیازەکان، بەپێی بۆچوونێکی مرۆڤناسانە لەمەڕ تاکی مرۆڤ، جێگەی گومانە و پێویستی بە باسێکی تیۆریکی ئانتولۆژی

[50] Fondamentalisme.

وجودی كۆمەڵایەتی هەیە و لەم بوارەدا گەڕانەوە بۆ روانگەكانی لوكاچی پیر كارساز و رۆشنگەرانەیە[51].

ب) ئەم توێژینەوەیە لەمەڕ شۆڕشی ئۆكتۆبری 1917 زۆر رواڵەتی و پڕكێشەیە.

ج) وادیارە كە دیكتاتۆری لەسەر نیازەكان، بەرلەوەی وەك هۆكارێك بێت، دەبێ بە سیستمێك لە هۆكردەكانەوە ببەسترێت كە حكومەتی جۆری سۆڤیەت توانای كۆنترۆڵیانی نییە و لە بنبەستی مێژوویی ئەوروپای رۆژهەڵات و سۆڤیەت جیاناكرێتەوە، بنبەستێ كە دەبێ لە ناخی رێكخستنەوەی دووبارەی سەرمایەداری جیهانی لە سەدەی بیستەمدا توێژینەوەی لێ بكرێت.

د) كاتێگۆری دیسپۆتیزمی گشتگیر كە نووسەرانی ئەم قوتابخانەیە بەكاریان بردووە و چەمكی "قووتدان"ی كۆمەڵگەی مەدەنی بەهۆی كۆمەڵگەی سیاسی (حیزبی– دەسەڵاتدار)ەوە، زۆر جێگای شك و گومانە، نە بەهۆی راڤەكاریەكان، بەڵكوو بەهۆی بەڵگە و بنەماكانیەوە: یانی ئەگەری هەبوونی جیایی نێوان هەرێمی سیاسی و كۆمەڵایەتی بەدرێژایی مێژوو.

[51] Zor Ontologie des gesellshaftlichen Seins, Neuwide, Luchterhadd, 1971-1973, Noets on Lukacs Ontology Par Fehr, Heller, Markus et Vajda, in Lukacs Reconsidered Black well, 1983.

# سەرنجێك لە قوتابخانەی بوداپێست

## فرانسوا ریڤێر

قوتابخانەی بوداپێست چیە؟ بۆچی ئەمڕۆ لە **لەتان مۆدێرن**[52] [ڕۆژگاری نوێ]دا باسی ئەم قوتابخانەیە دەكرێ؟

لوكاچ لە نامەیەكدا بەرێكەوتی 15فوریەی1971و لە بڵاوكراوەی times literary supplement دا دەستەواژەی **قوتابخانەی بوداپێستی** بەكاهێناوە.[53] ئەم دەستەواژەیە ئاماژە بە گرووپێك دەكا كە لوكاچ و شاگردەكانی پێكیانهێناوە، بەكورتی: فرێنس فێهر، ئاگنش هلێر[54]، جورج ماركوش و میهای وایدا (بیرمەندانێكن كە لە كۆتایی نامەكەی لوكاچدا بەرهەمەكانیان ناسێندراوە). ئێستە بێجگە لەم بیرمەندانە كە بەجۆرێك لەگەڵ لوكاچی پیر لەپێوەندی دان، كۆمەڵناسانیش زیاد دەكەن: ئاندراش هێگدوش، ماریا ماركوش[55]، و بەگشتی تێكڕای ئەو ڕووناكبیرانەی كە لە ڕژێمی دەسەڵاتدار ڕەخنەدەگرن.

---

[52] Les Temps Modernes.

[53] وەرگێڕانی دەقی ئەم نامەیەمان لەم كتێبەدا هێناوە.

[54] وەرگێڕانی وتارێكی ئاگنش هلێر مان بە ناوی **تیۆری و پراتیك بەپێی نیازە ئینسانییەكان** لەم كتێبەدا هێناوە.

[55] وەرگێڕانی بەرهەمێكی هاوبەشی ئەوان : **كاتی ئازاد و دابەشبوونی كار** لەم كتێبەدا هاتووە.

ئەم کارەی نووسەری **مێژوو وشیاری چینایەتی** لە ناودێرکردنی قوتابخانەی بوداپێست دا رەنگە ببێتە مایەی سەرسورمان. چوونکە ئەگەر لەبیرمان بێ [لوکاچ] لە تەمەنی بیست ساڵیدا وڵاتەکەی بەجێهێشت، ماوەی دە ساڵ لە زانکۆکانی ئەڵماندا دەرسی خوێند، پاشان، لە دوای تێکشکانی کۆماری شوراکانی هەنگاریا ساڵی 1919 نارچار بە کۆچ کرا و دە ساڵ لە نەمسا و دواتریش دە ساڵ لە سوڤیەت ژیانی بردەسەر. کاتێ گەڕایەوە بۆ هەنگاریا، نزیکەی شەست ساڵ تەمەنی بوو، کەچی دیسان هەر بە زمانی ئاڵمانی دەینووسی. هەروەها، لە زانکۆی بوداپێست دەرسی دەگوتەوە هێندەی پێنەچوو کە دەستەیەك لە دۆستان و شاگردەکانی کە لە رەوتی ئالوگۆڕی فکری ئەو و هەروەها رەخنەکانی ئەو لە بروکراسی سیاسی سیستمە "سۆسیالیستەکان" بەتەواوی ئاگاداربوون، لە دەوری کۆبوونەوە. ئەم رەخنەیە کە لە دوا وتووێژی لوکاچ لەگەڵ ژۆرنالیستە رۆژئاواییەکان[56] دا بەرۆشنی دەرکەوتبوو، لەنێو ئەو بەرهەمانەدا کە خودی لوکاچ چاپی کردووە، بەدی ناکرێ. جگە لەوەش جێگەی نگەرانیە کە بەشێك لەم رەخنەیە کە لە وتووێژەکەدا بلاونەکراوەتەوە، بەم زوانەش بلاونەکرێتەوە. لەراستیدا، کاربەدەستان، بە سەرنجدان بەو بابەتانە کە خودی لوکاچ نووسیوونی و بلاوی کردوونەتەوە— لەوانە بابەتەکانی سەردەمی ستالینیزم— پێیان وایە کە سیمای فکری ئەم بیرمەندە گەورەیە پێشتر بەشێوەی حەتمی دیاریکراوە، ئەڵبەت بەو ئالوگۆڕانەوە کە "نەمریی" ئەو پێویستییەتی! ئەم کاربەدەستانە کە بەرهەم و دەستنووسەکانی لوکاچیان پاوانکردووە، ئەمڕۆ دەتوانن "مومیایی" خۆیان کە وەك "شانازییەکی نەتەوەیی" بێزیانی لێهاتووە، بەسانایی

[56] بروانە بۆ دوا گفتوگۆی لوکاچ کە چەند هەفتە بەرلە مەرگی لەگەڵ یون بوردە کردوویە. دەقی ئەم گفتوگۆیە لەم بەرهەمەی خوارەوەدا هاتووە:
Figures de Lukacs, ed Anthropos, 1972,pp. 167-207.

بپارێزن. لەڕاستیدا ئەوان هەر بە پاوانکردنی بەرهەمەکان وازناهێنن، ئەوان پەیکەری لوکاچ لە هەرچەشنە چەوت ئایینی[57] یەك خاوێن دەکەنەوە: لە پاش مەرگی لوکاچ، بووکەکەی (کە لە کاتی تۆمارکردنی گوتوبێژی 16ی ئاوریلی 1971دا بەشداری کردبوو) لە نامەیەکدا داوادەکا بەر لە بڵاوبوونەوە، دەقی وتووێژەکە ببینێ تا بتوانێ پیابچێتەوە کە نەبا لوکاچ – بەوهۆیە کە بە زمانی فەرانسی قسەی کردووە– لەرووی کەمتەرخەمیەوە شتێکی گوتبێ کە لەگەڵ نووسراوە سەرەکییەکانی دژایەتی هەبێ، یان لەوەش سەیرتر "لەگەڵ ئەوشتەی کە شاگردانی چاوەڕوانییان لێدەکرد" سازگار نەبێ. "میراتدارانی" لوکاچ کاتێ نەیانتوانی ئاوا سانسۆرێك ئەنجام بدەن، لە ڕۆژنامەکاندا چەندین ئاگادارییان بڵاوکردەوە کە گۆیا دوایین وتووێژی بیرمەندی پیر "گاڵتە و گەپێکی ڕووت بووە لەگەڵ ڕێبوارانی ڕۆژاوایی". ئەوان بە کەڵکوەرگرتن لەم فێڵە توانییان بەتایبەت لەسەر ئەم پرسە جەخت بکەن کە بەناو شاگردانی لوکاچ لەپاش مەرگی مامۆستاکەیان، ئەندێشەی ئەویان چەواشە کردووە و بەلارێیاندا بردووە. سەرەڕای هەموو ئەمانەش گۆیا کاربەدەستان سەرئەنجام بەو ئاکامە گەیشتوون کە تیۆری چەواشەکردن نەیگرتووە و ئەمرۆ ئەمە بە باشتر دەزانن کە لەمەڕ خودی لوکاچ بێدەنگ بن و تا کاتێ کە پێویستە، ئەو لە دۆخێکی نێوەنجی و نیوبەندا رابگرن.

راستیەکەی ئەمەیە کاربەدەستان لە کاتی ژیانی لوکاچدا، نەیاندەتوانی ڕەوتی ئاڵوگۆڕی **قوتابخانەی بوداپێست** نادیدە بگرن، بەڵکوو بە رادەی بەرتەسك و لە ئاڵقەیەکی بچووکدا چاوپۆشییان لێدەکرد. هەنگاریا لەنێو وڵاتانی سلاڤدا، لەرووی نەتەوەیی و زمانییەوە دۆخێکی تایبەتی هەیە. ئەم دۆخە، لەنێوان هەنگارییەکاندا، کە چەندین جار لەلایەن تورکەکان، نەمساییەکان و پاشان رووسەکانەوە داگیرکراوە، هەست و

[57]Heterodoxe.

ئینتمای سەربەخۆیی خوازی زیاتر هەڵگیرساندووە. خودی کادار[58]یش کە لەلایەن خرۆشچۆفەوە وەك سەرۆکی دەوڵەت دیاری کرابوو، لە سەرەتای شۆڕشی خوێناوی 1956 دا، وەك لوکاچ، لە دژی دەسەڵاتی ستالینی تێکۆشابوو. خرۆشچۆف و جێگرەکانی لە قۆناغی یەکەمدا ئەو دەرفەتەیان بۆ ڕژێمی کادار رەخساند، تا بەشێوەی بەرتەسك و سنووردار فەزای داخراو بکاتەوەو بەمجۆرە بەئەسپایی شۆڕشی 1956 لەبار ببات. بۆ وێنە لە بواری سیاسیدا لەنێو نوێنەرانی هەڵبژاردنەکاندا بەشێوەی کەمرەنگ جۆرێك فرەچەشنی دەبینرا. لە بەستێنی ئابووریدا، نیوچەسەربەخۆییەك بە دام و دەزگاکانی بەشی کشتوکاڵ و پیشەسازی بچوك درا کە بەهۆی خێر و بەرەکەتی مکانیزمی بازاڕی ئازاد، دەوڵەمەند بوونەوە. لە بواری فەرهەنگیدا، ئەو دەورە بزوێنەر و کاریگەرەی کە روناکبیران لە پێکهاتنی شۆڕشی 1956 هەیانبوو، فەرامۆش نەکرابوو و رژێمی کادار لە نزیکەی ساڵەکانی شەستدا لەئاست روناکبیران بە نەرمی دەجووڵایەوە. ئەو رۆشنبیرانەی کە من توانیم بیانبینم، دەیانگوت لەو سەردەمەدا بارودۆخیان "خراپ" نەبووە. توانیویانە کۆڕی وتارخوێندنەوە بگێڕن، سەفەر بکەن (بەتایبەت بانگهێشتی زانکۆکانی دەرەوە قبوڵ بکەن) و ئازادانە بنووسن و بڵاوی بکەنەوە– بەتایبەت بە زمانی باو بێجگە لە زمانی هەنگاری، ئەگەر دەرسەکان، یان وتارخوێندنەوەکانیان لە دەرەوە ببوایە، بەرهەمە بڵاوکراوەکانیان– تەنانەت بەرهەمی تەواو رەخنەگرانەش – هات و هاواری بەرپا نەدەکرد یان بە وتەیەکی رۆشنتر، ئەگەر رۆژنامەکانی ناوخۆ لەو بارەوە شتێکیان نەنووسیبا، کاربەدەستانیش بێدەنگییان لێدەکرد. لەمەڕ بەرهەمی بڵاوکراوە بە زمانی

[58] Kadar، سیاسەتمەداری هەنگاری (1922)، سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیستی هەنگاریا (1956). پاش شۆڕشی بوداپێست(4ی نوامبری 1956) رووسەکان ئەویان وەك سەرکۆماری وڵاتەکەی دیاری کرد. ساڵی 1958 سەرلەنوێ بوو بە سکرتێری گشتی حیزب. وەرگێڕ.

هـەنگاریش ئـەو بیرمەنـد و كۆمەڵناسـانەی كـە كارمەنـدی ڕەسمـی دام و دەزگـای دەوڵـەتی بـوون، زیـاتر بـەهۆی داكـۆكی لـە ڕوانگـەی چـەوت سەرزەنشـت نـەدەكران، بـەڵكوو بـەهۆی بڵاوبوونـەوەی ئـەم ڕوانگـە لـە گۆڤارێكی فرەتیراژدا سەرزەنشـت دەكـران، چـوونكە وەهـا نووسـراوەیەك دەبـێ تایبـەت بـە بلاڤـوكێكی كـەم خوێنـەر بێـت. بەرۆشـنی دەتـوانین تێبگـەین كـە ئـەم جـۆرە كرانـەوە شـێنەیی و كـۆنترۆڵكراوە تـەنیا بـۆ كردنـەوەی "سـوپاپی متمانـە" لەبەرچـاو گیرابـوون. بـەڵام بۆچـی دواتـر سەرەتا بە لەمپەرێكی نەبینراو و پاشان بـە فـەرمانی وەسـتانی حـەتمی و لەناكاو ڕاگیرا؟

گەشـەی لەمپەربـەزێن و مەهارنـەكراو و گەشـندەی "كرانـەوە" لـە چكسلڤاكیا زەنگی مەترسی وەدەنگ هێنا. وەك دەزانین ئەم بزاڤـە سـاڵی 1968 ڕانەوەستا و تەنیا "بە یارمـەتی برایانـە و هاوكـاری چـەكدارانەی" وڵاتـانی پـەیمانی ڤۆرشـۆ سـەركوت كـرا. لـەوە بـەدوا ئـیتر كرانـەوەی بەشێنەیی فەزاكان "گەنـدەڵی" پڕمەترسـی بـەدواوەبوو. بەمهۆیـە دەبـوو كۆتـایی پێبێـت، بـەڵام "ئاسـاییكردنەوە" لـە هـەنگاریا، پارێزكارانـەتر، ئـارامتر و – لەمـەڕ ڕونـاكبیران – درەنگـتر ئەنجامـدرا، ئەمـەش لـەژێر كاریگەری لوكاچی پیردا بوو كـە – بەپێچـەوانەی ڕەخنـەكانی– بـەردەوام دووپاتی دەكردەوە كـە **خـراپترین سیسـتمی سۆسیالیسـتی لـە چـاكترین سیسـتمی سەرمایەداری باشترە،** هەر ئەو لوكاچەی كە ئەوەنـدە بەختـەوەر (یـان خـۆش فكر و بلیمەت) بوو كە بتوانێ لە پاكتاوكردنـەكانی سـتالین ڕزگـاری بێـت. ئێستە چۆن دەكرێ بیرمەندی ماركسیست تاوانبـاربكرێ، لـە كاتێكدا كـە خودی ستالینیش لە گەڵی ڕاهاتبوو؟ لوكاچ كە بە تەمەنی زیاتر لە هەشـتا سـاڵ، لـە هـەموو جیهانـدا ناسـراوە و جێگـای ڕێـزە، بەرهەمـەكانی دەخوێندرێتـەوە و ئـیتر لـە شـانازی و شـكۆمەندی پـاش مـەرگی خـۆی دڵنیایە، بەو "كەنارە دوورە گەیشتووە كە ئیتر تیری ڕاوچیان نایگاتـێ".

ئیتر ناکرێ بە ئاشکرا سەرکوت بکرێ و قوتابخانەکەشی لەژێر پشتیوانی واقعی خۆیدا پەرەدەگرێ.

لە پاش مەرگی لوکاچ لە چواری ژوئەنی 1971دا و پاش تێپەڕینی ماوەیەکی شیاو، کاربەدەستانی دەوڵەتی کە بەجۆرێ داب و نەریتی فۆرماڵیتەیان کردۆتە سپەری بەلای خۆیان، هەر وەك چاوەڕوان دەکرا، گوتیان ئەوکەسانەی کە لوکاچ لە نامەی 15 فوریەی 1971دا بە شاگردی خۆی زانیون و ستایشی کردوون، ئێستا پڕوپاگەندەی ڕڤیزیۆنیزمی وردەبورژوازی دەکەن، کە بەڕای کاربەدەستان ئەمە کارێکی "دژە مارکسیستییە". ئەم دوا ناتۆرە زۆر پڕمانایە، ئەڵبەت ئەگەر لەبیرمان بێت ئەوەی ئەندامانی ئەم مەکتەبە یەکانگیردەکات، ئەمەیە کە ئەوان بە پێڕەوی لە مارکس و لوکاچ، مارکسیزم بە دەرسێکی زۆرەملی نازانن، بەڵکوو بە جۆرێ مێتۆدی[59] دەزانن. لە ڕاستیدا لوکاچ نووسیبووی: *مارکسیستێکی "ئۆرتۆدۆکسی جدی (...) دەتوانێ هەموو تێزە تایبەتەکانی مارکس ڕەتبکاتەوە، بێئەوەی کە، تەنانەت بۆ ساتێکیش ناچار بێت لە ئۆرتۆدوکس بوونی خۆی دەس هەڵگرێت، چوونکە ئۆرتۆدوکس بوون لە مارکسیزمدا تەنیا... بە مێتۆدەوە بەستراوە."*[60] بەڵام وەها ڕوانینێك لەلایەن "کۆمۆسیونی سیاسەتی فەرهەنگی" کۆمیتەی ناوەندی و دواتر، لەلایەن "سکرتاریەتی" حیزبی کۆمۆنیستی هەنگاریاوە، وەك ڕەتکردنەوەی نێوەرۆکی دۆکترینی بنەڕەتی شۆڕشی سەقامگیرکراو لەقەڵەم درا، یانی وەك پرسیارێك راڤەی دەکەن کە بەڕای ئەوان یەکپارچەیی حاشاهەڵنەگری "میراتی تیۆری مارکسیزم ـــ لێنینیزم" خەوشدار دەکات. لە هەمان حاڵدا کە هەندێ جار بەرواڵەت قەبوڵ دەکەن کە توێژینەوەی زانستی دەبێ کراوەبێت (ئەگینا توێژینەوە

[59] Methode.

[60] Hestoire et conscience de classe, Paris, ed. De Minuit, 1960, p. 17-18.

لەمەڕ ئەو شتانەی کە پێشتر ڕوون بۆتەوە، ئیتر هیچ مانایەکی نابێت.) ئەوان قەت نەیاندەتوانی قەبوڵ بکەن کە دەکرێ توێژینەوە "فرەچەشنی"[61] بێ و بە دۆکترینی "مارکسیزمی فرەچەشنی" بگات. ئەوان بە ئاشکرا دەیانوت کە ... ئیمکانی نیە لە یەك کاتدا چەندین هەقیقەت هەبێ، ئەو خاڵە کە ئەوان "لەبیریان دەچێ" ڕوونی بکەنەوە ئەوەیە کە چ کەس و لە چ پۆستێکدا شایستەیی ئەوەی هەیە کە بۆ وێنە لە بواری فەلسەفە و کۆمەڵناسیدا هەقیقەت ڕاڤەبکات؟ لەراستیدا کاربەدەستان بە هێنانەوەی بەڵگە و داکیۆمێنتی[62] زانستی و، بە توێژینەوەی قوڵتر، کۆمەڵناسانی مەکتەبی بوداپێستیان تاوانبار نەدەکرد، بەڵکوو لە پۆستی سیاسیدا و بە گەڕانەوە بۆ نووسراوە ئاسمانییەکان و بۆ پاراستنی بنەما دوگم و قەتیسەکان، ئەوان بێحورمەت دەکەن. (یان بە وتەیەکی ڕۆشنتر دەیانەوێ لە مەیدان وەدەریان نێن). ئەوان چ بزانن یان نا، چ بیانەوێ یان نا، بەمجۆرە هەلومەرجی دادگایی کردنی گالیلە دەخولقێننەوە. سەرئەنجام یارمەتی ویستنی ڕواڵەتی ئەوان لە دیالکتیکی مارکسیستی، وەك دروشمێکی بۆشی لێدێت، ئاخر چۆن لەمە زیاتر هەڵدەگرێ، کاتێ تێبگەین کە لە ڕوانگەی مارکسدا، دیالکتیك، یانی: *"توێژینەوەی زانستی و سەربەست"، " لە سیمای ئەقڵانی خۆیدا (...) بۆ چینە دەسەڵاتدارەکان و ئایدۆلۆژیستەکانیان مایەی شەرمەزاری و رسواییە (...) چونکە دیالیکتیك دەرکی کردووە کە هەمان بزاڤ کە هەموو شتێکی پێکهێناوە، تەنیا قەوارە[63] یەکی کاتییە، هەر بەمهۆیە هیچ شتێ ناتوانێ لە سەر ئەو زاڵ بێت، چونکە لە بنەرەتدا رەخنەگرانە و شۆڕشگێرانەیە".[64]*

[61] Pluralisme.
[62] Demonstration.
[63] Configuration.
[64] "دواگوتاری" ژانویەی 1873 بۆ دووهەمین چاپی ئاڵمانی سەرمایە...

ڕۆشنە کە بەکارهێنانی ئەم جۆرە مێتۆدە دیالکتیکییە لە پانتایی فاکتە بەرهەستەکانی "دیموکراسی جەماوەری" هەنگاریادا کاریگەری "شۆرشگێرانەی" دەبێت، ئەم کارتێکردنەش ئەوکاتە ئاشکرا دەبێت، کە بۆ نموونە ئاگنش هلێر سەبارەت بە مانای خەسڵەتی وردەبورژوایی ژیانی ڕۆژانەی وڵاتی خۆی و مانای نەگۆڕی پێکهاتەی نەریتی بنەماڵە (کە ئنگڵس پێی وابو سەلماندوویە کە ئەوانە بەرئەنجامی ملکداری تایبەتییە) تۆژینەوە دەکات. ئاگنش هلێر دەیەوێ پێشان بدات کە ئالۆگۆڕی پێکهاتوو لە دام و دەزگای ڕێبەریدا، لەسەر چینی خواروی کۆمەڵگا کاریگەری نەبووە و لە نیازەکانی مرۆڤدا ئالۆگۆڕی شۆڕشگێڕانەی نەخولقاندووە. بۆوەی کە ئازادیخوازی تەنیا بۆ تاقمێك وەك پێویستی دەرکەوتووە، ئیمکانی نیە بێجگە لە شێوازە جۆراوجۆرەکانی فەلسەفەی "بەهاکان" بە جۆرێکیتر دەرکەوێت، چونکە شکستی کردار[65] تیۆریش دەگرێتەوە. کۆمەڵگای "سۆسیالیستی" هەنوکەیی، بەمجۆرە بە پاراستنی پێکهاتەی فکری کۆمەڵگەی "کۆن" ڕۆڵێکی یەکانگیرکار[66] دەگێڕێ [و لەگەڵ ئەو هاوڕەنگ دەبێ]. هەر بەمجۆرە بروکراسی سیاسی ناتوانێ قەبوڵ بکات، کە بۆ وێنە، ئاندراش هێگدوش بتوانێ بەڕاشکاوی لەخۆی بپرسێ ئایا لەنێوبردنی خاوەنداری تایبەتی ئامێری بەرهەمهێنان (یانی سەرنگونی سەرمایەداری تاکە بورژوا دەوڵەمەندەکان) لەخۆڕا[67] بە سۆسیالیزمێك بە هەڵسوڕیی کۆمۆنیزم دەگات، یان بە جۆرێ بەستویی بروکراسی "شێوەی بەرهەمهێنانی ئاسایی" دەگات. لێرەدا ئیتر نە تەنیا خاوەنداری تایبەتی ئامێری بەرهەمهێنان، بەڵکوو خاوەنداری تایبەتی

---

[65] Praxis.
[66] Integrateur.
[67] Ipos facto.

ئامێری بڕیاردان له دهستی چین (یا توێـژ)ێكـی تـازه دایـه كـه سیسـتمی ئـابووری ڕێبـهری دهكـا و سـهعاتی كـار و، ڕادهی مووچـه و مۆنۆپـۆلی بازرگـانی دهرهوه ڕێكـدهخات. تیۆریداڕێـژانی دهوڵـهتی لـه وههـا توێژینهوهیهك زۆرتر دهترسێن لهجیاتی ئهوهی بوێرن بـه ڕاشـهكاری ڕهتـی بكهنهوه(چوونكه لهم حاڵهدا كهم تـا زۆر پـهره بـه تێۆرییـه ڕهتكراوهكـان دهدهن). كـهوابوو باشـتر وایـه بـه ڕوانگـهی چـهوت و چهواشـهی كـۆڕێكی بچوك لهقهڵهمی بدهن. ئهوان بهتایبهت ئهوه به باشتر دهزانـن كـه لهسـهر بابهتی ڕواڵهتی و یهكچهشنی ماركسیزم بهڵگهبێننهوه، چونكه ڕۆشـنه كـه ئـهم دۆكترینـه یهكچهشـنییه، بناغـهی پێویسـتی دهسـهڵاتی دهوڵـهتی و ههروهها هۆكاری حهتمی قسردهرچـوونی هـهر توێژینهوهیـهكی زانسـتییه. داگیركردنـی ههمهلایهنـه و میراتدارانـهی ههقیقـهت، لـه هـهمان حاڵـدا شاردنهوهی دهسهڵاتداریی له پۆششی داكۆكی لـه دۆكترینـی [شـۆڕش]دا ههموار دهكات.

پاراستنی دهسهڵاتێك كه له شۆڕش بـه مـیرات گهیشـتووه، بهشـێوهی ڕههـا وهك ڕێخراوهیـهكی پارێزكـار دهرناكـهوێ، بـهڵكوو وهك كردارێكـی ههردهم گهشهنده دهردهكـهوێ كـه لهئاسـت گهرانـهوه بـۆ دواوه، یـان لـه ههمبـهر دژهشـۆڕش بـهرهنگاری دهكـات. ئـهم وشـیاریه پـڕ ڕزق و برقـه "شیاو"ـه (كه لهودیو تێكڕای نیازپاكیه ناشیاوهكاندا ڕوهـهڵماڵراوی خـۆی دهشارێتهوه) باشترین پاساوی سـهركوته، چـونكه ئیمتیـازی داگیركردنـی ههقیقـهتێك كـه بـهپێی پێناسـه، تاقانهیـه، بناغـهی پێویسـتی هـهرجۆره بیرپشـكنینێك[68] پێكـدێنێت، تهنانـهت ئهگـهر ئێسـتاكه– و بـهپێی ئـهو

[68] Inquisition.

بەرژەوەندییە کە باسمان کرد– وەها بیرپشکنینێك بەشێوەی پسپۆڕانە و بە سەندنەوەی ریاکارانەی پۆئەنی چەند روناکبیرێ بەئەنجام بگات. لەراستیدا ئەندامانی مەکتەبی بوداپێست تەنیا کارەکانیان لە بواری فێرکاری و توێژینەوەدا دۆڕاندووە. کاربەدەستان تەنیا بە پێشگرتن لە سەفەری دەرەوە و لە بڵاوبوونەوەی ڕوانگەکانی ئەوان وازیان هێناوە. زۆربەی ئەوان بۆ درێژەدان بە ژیان ناچار بوون هەموو هێز و توانای خۆیان لە وەرگێڕاندا تەرخان بکەن، کارێك کە – بەپێی وتەی لورا بوئلا[70] – "مێتۆدێکی زراڤە بۆ لەکارخستنی مێشکیان". "مێتۆدی زراڤ" نە تەنیا بەوهۆیە کە خوێناوی نییە، بەڵکوو بەوهۆیە کە شاراوەیە. ژورنالیزمی رۆژاوایی کە هەموو شتێك سەبارەت بە سولژنیتسین بڵاودەکاتەوە لەسەر هەموو رووداوەکانی پراگ و بلگراد فوکوس (تەرکیز) دەکات تا رادەیەك هەواڵی دادگایی هاراستی بڵاوکردەوە بەڵام لەمەڕ دۆخی شاگردانی لوکاچ بێدەنگی هەڵبژاردووە.[71] ئایا هەر ئەمە هۆکاریکی

---

[69] هەر بەوجۆرەی کە سولژنیتسین باسی دەکات: "خەون و خولیا و هێزی دەروونی جنایەتکارانی شیکسپێر لە رادەی دە دوازدە تەرم سەرتر نەدەچوو، چوونکە ئەوان ئایدیۆلۆژییان نەبوو." بۆ خوێنرێژ بوون دەبێ گەشبین بیت.

[70] Laura Boella، مامۆستای زانکۆی پیزا (Pisa) لەمەڕ دوابەرهەمەکانی لوکاچ کار دەکات. ئەو لەو یەکەم کەسانەیە کە لە دەرەوە ئەندێشەی شاگردانی لوکاچی ناساندووە. بۆ وێنە بڕوانە بۆ:

"Ontologia e teoria della vita quotidiana nella ricerca filosofica scuola di Budapest". Rivista internazionale di filosofia del dirrito (2-1973, pp.263-84)

[71] تا جێگایەك من بزانم تەنیا گۆڤاری Manifesto راپۆرتێکی قووڵ و رۆشنی لەم بابەتە ئاراستە کرد.

گونجاو بۆ ناساندنی ژیان و بەرهەمەکانی ئەوان بە خوێنەرانی **لەتان مودێرن** نییە؟

ئەڵبەت ئەم بەرهەمەی بەردەستان (کە ئەندامان و لایەنگرانی مەکتەبی بوداپێست بەهۆی ترس لە خەفەقان نەیانوێراوە هاوکاری بکەن) بەتەنیایی ناتوانێ بروکراتەکان لەقاو بدات. ئێستا ئەگەر وایدابنێن ئەم توێژینەوەیە کە ئێمە لەمەڕ ئەوان کردوومانە بەتەنیا ناتوانێ کاریگەری قووڵی هەبێت، بەتایبەت بەوهۆیە کە ئەوان گیرۆدەی مکانیزمێکن[72] کە لە یەکە یەکەیان بەهێزترە. وادیارە کە ئێستاکە، دەسەڵاتی فراوانخوازنەی پەیمانی ڤۆرشۆ، "ئاساییکردنەوە" لە هەنگاریادا بە دوو هۆ بە باش بزانێ: لە پلەی یەکەمدا، هەنگاریا سنووری هاوبەشی لەگەڵ یوگسلاڤیا هەیە کە لەرووی ستراتژیکەوە دەوری گرنگی هەیە و ئەم فەرزە وێنا دەکرێت کە رەنگە رووسەکان "لە حاڵی رووداوێکی پێشبینی نەکراو" بۆ نموونە، لە کاتی مەرگی تیتۆدا، بیانەوێت دەس تێوەردەن. لە پلەی دووهەمدا رێفۆرمی ئابووری هەنگاریا کە چەمکی سوودهێنەریی لەگەڵ بازار هێناوەتە ئاراوە، ئەو دام و دەزگایانە کە بۆ رووسەکان کاردەکەن، تووشی مەترسی کردووە. ئەوان بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان هەڕەشەیان کردووە کە ناردنی نەوتی خۆیان بۆ دەرەوە کەم دەکەنەوە. جگە لەوەش رەنگە لیبراڵەکانی پێشوو کە زیاتر لە هەموان لە مەترسی رەوتی تازەی "ئاساییکردنەوە"دان، بە مەبەستی پاراستن و باشکردنی دۆخی خۆیان، لەو داخوازیانە کە رووسەکان بەئاشکرا بەیانیان کردووە، سەرتر چووبن و گەشەیان پێدابێت ــ بەتایبەت بە هەوڵی پرهەراوە لە بواری رێفۆرمی فەرهەنگیدا. ئەم کارەش کە وادەنوێنێ هەندێ کەس لەم

[72] لەم بابەتەوە بڕوانە بۆ:

Franz Eder, "Information aus Budapest" in Wiener Tagebuch, mai 1974, p. 5-6.

ئوپەراسیۆنە چاپلوسانەدا سەرنەکەوتن، تەنیا لەگەڵ"دەرسی مێژوو" پێوەندی هەیە. لە بەرانبەردا و لە بواری ئابووریدا، رێبەرانی هەنگاریا دەتوانن "رەوتی تازە" بەمجۆرە پاساوبدەن کە بە هێرش بۆ دەوڵەمەندانی نوێکیسە و ئیمتیازە جۆراوجۆرەکان، دەیانەوێ جیاوازی چینایەتی کەم بکەنەوە.

ئێستا (بۆ کورتکردنەوەی بابەتەکە) دەبێ وەبیری بێنینەوە کە لەنێوان ئەزموونی "کرانەوە" کە گۆیا گەشە و ئەکتیڤی ئەو لە مەبەستی "بڕیاردەرانی" سەرتردەچێ (وەك چکسلڤاکیا) و "پارێزکاری" چەوسێنەرانە و زەخت و زۆری بروکراتیك کە لە کورت ماوەدا مەترسی تەقینەوەی لێدەکرێ (وەك شۆڕشەکانی 1956 هەنگاریا) کورتە مەودایەك لە ئارادایە.

ئامانجی ئێمە ئەوەیە... کە تێکۆشین هەرچی زیاتر ئەم مەودایە زۆر قووڵتر بکەینەوە و بۆ نموونە دەرکی مانای واقعی ئەم دوا وتەیەی جۆرج ئاچل هەموار بکەین: "ئامانجەکانی هیۆمانیزم[73]، دیموکراتیزم[74] و سۆسیالیزم – باشترین و شەریفترین ئامانج و خولیا و مەرامی ئەخلاقی کە بەدرێژایی مێژوو پەروەردە کراون – لە نێو بەها مەعنەوی و [illegible][75]

[73] Humanisme.
[74] Democratisme.
[75]"Une intervive de Gyorgy Aczel" in LEcole et la nation, 240, Juin 1974, p. 41.

## پەراوێز

### چەن یاداشتێکی ژیاننـاسانە و کتێبنـاسانە لەمەڕ ئەندامانی قوتا بخانەی بودا پێست.

فرێنس فێهـر: سـاڵی 1933 لـە بوداپێسـت لـەدایك بـووە. لـە سـاڵی 1954بـەملاوە شاگردی لوکاچ بووە. لە ساڵی 1956 تا 1967 لە فێرگەی ناوەندی مامۆستای زمان بـووە. لـەم سـەردەمەدا چـەن بەرهـەمێکی لـە بـواری رەخنـەی ئەدەبیـدا نووسـیوە. لە1967 تا 1970 هاوکاری زانسـتی لوکـاچ بـووە. لـە 1970 تـا 1973 توێـژکاری ناوەندی مێژوونووسی ئاکادمی زانستەکانی هەنگاریا بووە. ساڵی 1973 بۆ نیشاندانی هاوپشتی لەگەڵ هاوکارانی خۆی کە بەهۆی بیرجیاوازی دەرکرابـوون، دەسـتی لـە کـار کێشایەوە. ئەم بەرهەمەی ف. فێهر بڵاوبۆتەوە:

Dostoievsky et la crise de l individu(1973).

ئاندراش هێگدوش: ساڵی 1922 لەدایك بووە. وەك خوێندكاری ئەنێستیتۆی تكنیكی، بوو بە ئەندامی نهێنی حیزبی كۆمۆنیست، دەسگیركرا، بەڵام لە زیندان هەڵات. پاش جەنگ لەنێو حیزبو حكومەتدا چەندین پۆستی گرنگی وەرگرت. لە1955–1965 دا بوو بە سەروك وەزیری حكومەتی هەنگاریا. لەپاش ساڵی 1956 لە بواری ئابووری و كۆمەڵناسیدا دەستی كرد بە كار و توێژینەوەی زانستی. لە بواری ئابووریدا بروانامەی خۆی پێشكەش كرد و لە زانكۆی ئابووری بوداپێست دەرسی ئابووری و كۆمەڵناسی وتەوە.

لە پاش 1963 دەزگای كۆمەڵناسی نوێی ئاكادمی زانستەكانی هەنگاریا بەڕێوەدەبات. لە كۆتایی ساڵی 1968 دا پۆستەكەی خۆی لە دەست دا و وەك بەڕێوەبەری توێژینەوەكان لە ناوەندێكی ئاكادمێكی دیكەدا كاری دەكرد. ساڵی 1973 لە حیزب دەركرا و كارەكەشی لە ئاكادمی زانستەكان لێ سەندرایەوە.

بەرهەمەكانی بریتین لە:

Le systeme des salaries dans l industrie,1960.

La sociologie bourgeoise et la realite sociale,1961.

Le develppement technique dans le cadre du socialisme, 1962.

La soclologie: les possibilities et les limites dune scince, 1966.

L home-letravail- la communaute, 1966.

Sur la structure de la societe socialist, 1966.

Un monde en mutation, 1970.

Bureaucratie ou gestion dexperts?

چەندین بەرهەم و وتاریشی (بە هاوکاری ماریا مارکوش) نووسیوە کە بە زمانەکانی ئینگلیزی، فەرانسی، ئاڵمانی، و ئیتاڵی بڵاوبوونەتەوە.

ئاگنش هلێر: ساڵی 1929 لە بوداپێست لەدایك بووە. لە ساڵی 1947ــەوە شاگردی لوکاچ بووە. پاشان لە بەشی فێرکاریدا جێگری ئەو بووە. ساڵی 1959 بەهۆی داکۆکی لە"ئەندێشەی چەوت و رڤیزیۆنیستی لوکاچ لە حیزب و زانکۆ دەرکراوە. ساڵی 1967 بوو بە توێژکاری گرووپی توێژینەوەی کۆمەڵناسانە و دواتر لە ناوەندی ئاکادمی زانستەکانی هەنگاریا دەستی بە کار کرد. ساڵی 1967 بە بۆنەی نارەزایەتیەك کە فێرگەی هاوینەی korcula لە یوگسلاڤیا رایگەیاندبوو، لەئاست داگیرکردنی چێکسلڤاکیا دژایەتی کرد. ساڵی 1973 لە ژیانی فەرهەنگی هەنگاریا دەرکرا.

ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤارانە بووە:

Praxis (Zagreb), social Practice (Toronto) Aut-Aut (Milano).

بەرهەمەکانی ئەمانەن:

De lintention aux consequences, une tentative dethique marxiste systematique (1957-1958).

L Ethique d Aristote (1959) L Homme de la Renaissance (1963).

LaVie Quotidienne (1968).

Valeur et Hestoire, essays(1969).

Hypotheses sur une theorie marxiste de la valeur (1970).

Sur les instincts (1973).

La Theorie des besoins chez Marx (Milano, 1974).

بەرهەم و وتارەکانی ئەو بە چەندین زمانی ئاڵمانی، ئینگلیزی، فەرانسی، پرتغالی، ئیسپانیایی، سێربی، کرۆڤاتی، رۆمانیایی و ئیتاڵی بڵاوکراونەتەوە.

جۆرج مارکوش: ساڵی 1934 لەدایك بووە. پاش تەواوکردنی خوێندن لە ساڵی 1957 لە زانکوی موسکۆ، لە بەشی فەلسەفەی زانکۆی بوداپێست مامۆستای مێژووی فەلسەفە بووە. ساڵی 1959 لە ناوەندی فەلسەفەی ئاکادمی هەنگاریا توێژکاری زانستی بووە. لە پلەی یەکەمدا لە بواری پرسەکانی ئیپیستمۆلۆژیدا کاری کردووە و پاشان لە بواری مێژووی فەلسەفە و مێتۆدۆلوژی زانستی کۆمەلایەتیدا کاری کردووە. ساڵی 1968 لە حیزب دەرکراوە. ساڵی 1973 کارەکەی لە ئاکادمی زانستەکاندا لەدەست داوە.

بەرهەمەکانی بریتین لە:

Le langage, la logique et la realite: Remarquse critiques sur "Tractatus" de Wittgenstein, 1963.
Le marxisme et "lanthropologie", 1966.
Les principales tendances de la philosophie occidentale modern, (en collaboration avec Zador Tordai), 1964.
La perception et le probleme esprit-corps, 1968.
Dans quelle mesure, une economie critique est-elle possible? (en collaboration avec Gy. Bence et J. Kis)

ماریا مارکوش: ساڵی 1936 لە پۆلۆنیا لەدایك بووە. ساڵی 1957 بواری فەلسەفەی زانکوی موسکۆی تەواو کردووە. سەرەتا وەك توێژکاری زانستی لە بەشی فەلسەفەدا و پاشان لە ساڵی 1963 بەملاوە لە ناوەندی کۆمەڵناسی ئاکادمی هەنگاریادا کاری کردووە. ئەو لە بواری کۆمەڵناسی ئابووریدا (بەتایبەت بە هاوکاری

ئاندره هێگدوش) چەندین توێژینەوەی ئەنجام داوە. هەروەها لەمەڕ پرسەکانی بنەماڵە و ئازادی ژنان توێژینەوەی کردووە. ساڵی 1968 لە حیزب دەرکراوە. ساڵی 1973 بەبۆنەی ئەندێشەی "دژەمارکسیستی" کارەکەی خۆی لە ناوەندی کۆمەڵناسی لەدەس داوە.

وتار و بەرهەمەکانی ئەمانەن:

Lhomme – le travail- la communaute (en collaboration avec A. hegedus), 1966.

C.W. Mills et la sociologie de lelite, 1962 Le choix et la prestige des professions, 1967; Le role des indications dans la planification de la consummation (en collaboration avec a. hegedus, 1967; Les femmes et le travail: lemancipation des femmes dans limpasse, 1970; Le temps de loisir et la division du travil 1971; La modernisation et les alternatives du progress social (en collaboration avec A. hegedus). 1973; Les mutations dans la fonction de socialisation et les modeles familiaux, 1974.

هەروەها چەندین وتاری جۆراوجۆری بە زمانەکانی فەرانسی، ئینگلیزی ئاڵمانی و ئیتاڵی بڵاوکردۆتەوە.

میهای وایدا: ساڵی 1935 لە بوداپێست و لە بنەماڵەیەکی چینی ناوەندی لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە بوداپێست و پاشان خوێندنی فەلسەفەی سەرەتا لە ئەنستیتۆی لێنین و پاشان لە ساڵی 1956 لە زانکۆی Eotvos Lorand لەژێر سەرپەرشتیاری ئاگنش هلێردا تەواو کردوە. دوای خوێندنی زانکو لەگەڵ ج. لوکاچ ئاشنا بوو و تا کاتی مەرگ شاگردی ئەو بوو.

لە1958 تا 1961 لە خوێندنگەی سەرەتایی و لە1961 تا 1973 لە ناوەندی فەلسەفەی ئاکادمی هەنگاریا مامۆستا بووە. ساڵی 1973 بەهۆی "فکری چەواشە"

لە پۆستەکەی لابراوە. ساڵی 1967 عنوانی "کاندیدی زانستی فەلسەفی" (هاوتای دوکترای دەوڵەتی) بەدەست هێناوە.

بەرهەمەکان، کتێبەکان:

Contribution a la critique de la conception phenomenologique husserlienne "scince", Budapest, 1968.

Aux frontiers du mythe du rationnel. La phenomenology de Husserl, Budapest, 1969.

وتارە گرنگەکان:

-"Le probleme de levidence",1964.

-"La representation objective de la nature de la praxis social",1967.

-"Fonction de la dictature fasciste", 1970.

بەرهەمە بڵاونەکراوەکان:

-Mouvement de masse et dictature / Etude sociologico-politique sur le fascisme, 1969-1970 ("function de la dictature fasciste" est un extrait de ce livre).

- Sur les traces de la dialectique/ Lukacs en 1918-1919.

-Mythe et realite de la communication, 1972.

- Vision du monde et gout artitique/ A propos de peinture, 1973.

# سەبارەت بە قوتابخانەی بوداپێست

## جۆرج لوکاچ

بوداپێست، 15ی فوریەی 1971

ئاغای کروکی خۆشەویست[76]

بۆ نامەکەی 31ی ژانویەی 1971 گەلێ سوپاستان دەکەم. پرسی "کتێبەکانی ئایندە" زۆر جێگای سەرنجی منە. ئەمە بابەتێکی ئالۆزە کە بە رای من دەبێ قوڵترین — دەرهەستترین و هەروەها بەرهەستترین — ویستەکانی هەر تیۆریداڕێژێکی وشیار بەشێوەی سەمەربەخش بەخۆیەوە خەریك بکات.

بەمبۆنەوەیە کە من بە پرسێکی تەوەری دەسپێدەکەم. پاش شەڕی جیهانی دووهەم دەرکەوت کە هەرکام لە دوو بلوکی جیهانی دابەشکراو دەبێ تەنیا لە ژێر دەسەڵاتی تاقە خەتێکی فکریدا خۆ رێکبخەن. لە جیهانی سۆسیالیستیدا دژەڕەوتێکی ئاشکرا لە ئارادا نەبوو، کە لەگەڵ چەواشەکردنی ستالینی مارکسیزم دژایەتی بکات. رۆژاوای سەرمایەداریش چووبووە ژێر دەسەڵاتی پاوانکراوی[77] نیوپۆزەتیڤیزمی شێوەژیانی[78] ئەمریکایی. رووداوە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم 25 ساڵەی دوایی، گەلێ زەبری

---

[76] نامەی لوکاچ بۆ دەستەی نووسەرانی گۆڤاری Times literary supplement کە وەرگێرانی ئینگلیزی ئەم نامەیەی بلاوکردۆتەوە(11ژوئەنی 1971). دەقی نامەکە کە بە زمانی ئاڵمانی نووسراوە بۆ یەکەمجار لە گۆڤاری Praxisی یۆگسلاڤیادا بلاوبۆتەوە (ژمارەی 2–3،1973)

[77] Manipulations.

[78] American way of life.

کاریگەری لە هەر دوو شێوەی پاوانخوازی ئایدیۆلۆژیك وەشاندووە و لە نێوان لایەنگرانیاندا شك و گومان و تەنانەت قەیرانی خولقاندوە. پێشکەوتنی گەشندە و بەشێنەیی ئەم ئاڵوگۆڕانە رەوتێکی بەشێوەی ناهەموار، بەڵام بەرۆشنی، ئاشکراکردووە کە تاقە ئامێری تیۆری – پراتیکی بۆ دەرخستنی مێژووی راستیيە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ لە دۆکترین[79] و مێتۆدەکانی مارکس دایە – ئەو دۆکترین و مێتۆدانەی کە لە چارەکە سەدەی رابردوودا لەبرەو کەوتبوون و سووکایەتییان پێدەکرا.

ئەگەر دەوری بەرهەمە تیۆرییەکانی خۆم لە گۆڕینی بیروڕای گشتیدا بە هەند وەرنەگرم، لەگەڵ خۆم درۆم کردووە. بەڵام سەرەڕای خۆشحاڵی خۆم لەم کاریگەرییە، دەبێ بڵێم گۆڕانێکی لەوچەشنە قەت کاری مرۆڤێکی تەنیا نییە. بەپێچەوانەوە ئەگەر بەسەرنجدان بە ئاخیزگە و کاریگەری خێرای نووسراوەکانم توێژینەوەیان لەسەر بکرێت، زیاتر روون دەبێتەوە کە تێکۆشانی تیۆریکی من هەرگیز تێکۆشانی ئەندێشەیەکی ئیزولە و دوورەپەرێز نەبووە، بەڵکوو لە گرسان و هەڵدانی بزاڤێك و قوتابخانەیەکی فکریدا کاریگەری بەرین و گەشندەی هەبووە.

هەرچەند کە هێگل و ئابوریزانانی کلاسیکی بریتانیا و سۆسیالیستە یوتۆپیستەکان لە پێکهاتنی سیستمی فکری مارکسدا کاریگەر بوون، بەڵام خۆشی بلیمەتێکی زانستڤان بوو کە زۆر کەشفی تازەی ئەنجامدا و بە یارمەتی ئەوان چەندین یاسای مێتۆدۆلۆژیکی بەردەوام کاریگەری تۆژینەوەی زانستی سەرکەوتووانە نووسیەوە. بۆ تاقیکردنەوەی کاریگەری رۆڵی کۆنکرێتی ئەم مێتۆدانە لە تێکڕای کاروباری ژیانی کۆمەڵایەتیدا و هەروەها بۆ پەرەپێدان بەم مێتۆدانە بوو کە لە درێژەی

[79] Doctrine.

تێكۆشانی تیۆری و فێركاری مندا قوتابخانەی ناسراو بە بوداپێست دامەزرا. ئەم قوتابخانەیە لە رێگەی توێژینەوەی تاكنووسانەی قۆناغە گرنگەكانی گەشەی كۆمەڵایەتییەوە تێكۆشاوە تا پێكهاتەكان و ئاڵوگۆڕی بنەمایی پرۆسەی مێژوویی– ئانتۆلۆژیك بەشێوەی كۆنكرێت و هەمەلایەنە رۆشن بكاتەوە، بەجۆرێك كە دەركی دروستی ئەو، ئاخێزگەی هەر مێتۆدۆلۆژییەكی ماركسیستییە. ئەمە كە تێكۆشانی قوتابخانەی بوداپێست لە بواری جیهانیدا زیاتر بە بەرهەمەكانی خودی من — كە زۆربەیان بە زمانی ئەڵمانی نووسراون — ناسرابێت، قەت نكۆڵی لەم راستییە ناكات كە ئێمە لەگەڵ روانگەیەك بەرەورووین كە گرنگییەكی زانستی بەرچاوی هەیە و بێگومان لە داهاتوودا زیاتر پەرەدەگرێت. ئەگەر بمەوێ وەلامێكی شیاو بە پرسیارەكەی ئێوە بدەمەوە، دەبێ بەگشتی گرنگترین بەرهەمەكانی قوتابخانەی ماركسیستی بوداپێست ئاراستەبكەم.

جیهانی ئەندێشەی ئەم قوتابخانەیە، بەپێچەوانەی بوارە فرەچەشنەكانی، جیهانێكی گونجاو[80] و خاوەن پێكهاتەیە[81]. هەڵسوڕترین ئەندامی ئەو ئاگنش هلێرە كە لەنێوان كارەكانی ئەودا سێ بەرهەم پیشاندەری چەن رەوتێكە كە ئامانجی ماركسیزمی ئەم قوتابخانەیە دەردەخات. **ئەخلاقی ئەرستوو**[82] و **مرۆڤی رنێسانس**[83] (دوو بەرهەمی تاكنووسی مێژوویین. یەكەم كتێب ئاسۆیەك لە تێكڕای فەلسەفەی ئەفلاتون و ئەرستوو ئاراستەدەكات. كتێبی دووهەم چەسپاندنی تەواو و هەمەلایەنەی كاسیرێر[84] ماركسیستێك پیشان ئەدات. باسی وردبینانە و

[80] Coherent.
[81] Structure.
[82] L,Etique D Aristote.
[83] L Homme de la Renaissance.
[84] Cassirer بیرمەندی ئالمانی (1874 – 1945).

پرشەوقی سەردەمێکی فکری کە مارکسیزم تا ئێستا بە قووڵی تۆژینەوەی لەسەر نەکردووە. ئەم دوو بەرهەمە لە توێژینەوەی مێژوویی پەتی ئێجگار سەرتر دەچن: سەردەمانێك کە ئەم کتێبانە باسی دەکەن — کۆتایی سەردەمی کۆن و یوتۆپیای چاخی رنێسانس — لەو سەردەمانەن کە لەو مەودایەدا لەخۆنامۆیی ئەوەندە پەرەی نەسەندبوو و، لەنێوان هێزە سروشتییەکانی مرۆڤ و وزە و توانایی تاکیی ئەودا کەمترین مەودا دەبینرا. ئەم سیستەمە فکرییە، ئاگنش هلێری بۆ نووسینی تۆکمەترین و دەوڵەمەندترین بەرهەمی بردووە: **ژیانی رۆژانە**[85] کە نێوئاخنی سەرەکی ئەو، دەرخستنی گشتێتی هەڵسوڕیی سیستەمی هەوڵ و تێکۆشان و مێتۆدەکانی ئەندێشەی رۆژانەیە. ئەم سێ کتێبە لەلایەن ناوەندی بڵاوکەرەوەی ئاکادیمی زانستەکانی هەنگاریاوە بە زمانی هەنگاری چاپ کراوە. **ژیانی رۆژانە** لە هەمان حاڵدا یەکێ لە گرنگترین نموونەی رنێسانسی ئانتۆلۆژی[86] مارکسیستی لەم دەیە دایە.

توێژینەوەکانی جۆرج مارکوش یش هەر لەم بەستینەدا جێدەگرن. بەڵام گەلێ ئاقاری ئێجگار جیاواز دەگرنەبەر. کتێبی ئەو: **مارکس و چەمکی گەوهەریی مرۆڤ**[87] یەکەم ئەزموونی مارکسیستی بۆ شرۆڤەی چەمکە بنەماییەکانی ئانتۆلۆژی مارکسی و مرۆڤناسی جیانەکراوە لەگەڵ ئەم ئانتۆلۆژییەیە. مارکوش لەم بەرهەمەدا، کارێکی ماناناسانەی[88] وردبینانە و ژیرانەی بە باشی بەئەنجام گەیاندووە— هەرچەند کە ئەم کارە بە یارمەتی کاربردی قووڵی مێتۆدەکانی مارکس ئەنجام ئەدات. بەرهەمی

[85] La vie quotidienne.
[86] Ontologie.
[87] Marx et le consept dessence humaine.
[88] Semantique.

رەخنەگرانەی مارکوش سەبارەت بە ڤیتگێنشتاین[89] و شرۆڤەی رەخنەگرانەی ئەو لەمەڕ پێکهاتەی پەڕخوازانەی ئاوەز[90] — کە لەنێوان بەرهەمە مارکسیستییەکاندا نموونەیەکی دەگمەنە — چەن بەرهەمێکی رەسەنن و بەپێی دەرکی هەرە بەرینی ئەندێشەکانی مارکس و ناسینی هەمەلایەنەی بوارە زانستییە تایبەتەکان زۆر شێواز و ئاسۆی نوێمان بەروودا دەکەنەوە.

بەرهەمەکانی میهای وایدا رەوتێکی تەواو جیاواز دەگرنەبەر: لە ئیپیستمۆلۆژی[91] یەوە بەرەو ئانتۆلۆژی کۆمەلایەتی و توێژینەوەی سیاسی کۆمەڵگا دەچنەپێش. وتاری ئەو لەمەڕ هوسرێل[92] بێجگە لەوەی یەکەم کۆششی راستینی مارکسیستی لە ململانێ لەگەڵ دیاردەناسی[93] و سیستمی فکری ئەودا پیشان ئەدات، بەڵکوو بەتایبەت پرسەکانی ئیپیستمۆلۆژی لە روانگەی پراتیکەوە، یانی ئانتۆلۆژی هەقیقی رۆشن دەکاتەوە. هەرچەند کتێبی ئەو لەمەڕ فاشیزم بەروالەت باسی بابەتێکی زۆر جیاواز دەکات، [بەلام] بەرئەنجامەکانی لەو پرسانەی کە گەلاڵەی دەکات ئێجگار سەرتر دەچن. بەڕای من ئەو گریمانەی کە ئەو ئاراستەی دەکات، یەکەم هەوڵی مارکسیستی گرنگە لەم بوارەدا.

هەروەها توێژینەوە لەمەڕ جوانیناسی[94] بەشێکی بەرچاو لە کارەکانی قوتابخانەی بوداپێست داگیردەکات. توێژینەوەی (هێشتا بلاونەکراوەی)

---

[89] Wittgenstein، بیرمەند و لۆژیکزانی ئینگلیزی (1889–1951)
[90] Perception.
[91] Epistemologie.
[92] Husserl، بیرمەندی ئالمانی (1859–1938).
[93] Phenomenologie.
[94] Esthetique.

فرێنس فێهر سەبارەت بە داستایۆفسکی[95]، بەپێی شرۆڤە لـەبیرکراوەکانی مارکس و بەپێی دەرکی قووڵی بەرهەم و بابەتە ئەدەبییەکان، راپـۆرتێکی تۆکمە و رەسەن لە زیندوویی فەرهەنگی روسـیا لـە کۆتـایی سـەدەی 19دا ئاراستەدەکات. فرێنس فێهر لە هەمان حاڵدا تیۆرییەکی مارکسیستی نـوێ لەمەڕ رۆمـان دێنێتـە ئـاراوە. جگـە لەمـەش کتێبەکـەی ئـەو بـەو دیالۆگـە چڕوپڕە کە لەسەر تاکگەرایی[96] مـۆدێرن هەڵیدەگرسـێنێ، لـە بەرهـەمێکی رووتی مێژووی ئەدەبیات ئێجگار بەرینترە.

*من بە بڕوای قووڵم گەیشتووم کە هـەر ئێسـتا و لـەنێو ئـەم بەرهەمانـە دایە کە فەلسەفەی داهاتوو دەڕسکێ و دەپشکوێ.*

[95] بەرهـەمی فـرێنس فێهـر لەمـەڕ داستایۆفسـکی سـاڵی 1973 بڵاوبۆتـەوە. کورتەیـەکی لـە گۆڤاری Telosدا چاپکراوە.

[96] Individualisme.

# چه‌پی مۆدێرنی هه‌نگاریا: کۆمه‌ڵناسی و شۆڕش

**سێرژ فرانکل و دانیال مارتن**

**ده‌قێـك كـه لـه پـێش چـاوتانه بـه زمـانی فه‌رانسـی نووسراوه و پێشتر به‌شێكی له‌لایـه‌ن Franz Marek ـه‌وه كراوه به ئاڵمانی و لـه Wiener Tagebuch (ژۆئه‌نی 1973) بڵاوكراوه‌ته‌وه. هه‌ر دوو نووسه‌ری ئه‌م وتـاره لـه‌ژێر چـاودێری پۆلیسـی هـه‌نگاریادا بـوون... بۆوه‌ی مه‌ترسی ئه‌وه هه‌یه كـه پۆلیسـی هـه‌نگاریا (بـۆ پیشاندانی جدی بوون و پسپۆڕ بوونی خۆی) ره‌نگه بـه هه‌ڵـه كه‌سـانێكی بێتـاوان بگرێـت. به‌دڵنیایـه‌وه راده‌گه‌یه‌نین كه فرانكـل و مـارتن خـه‌ڵكی هـه‌نگاریا نین و له‌و وڵاته ناژین.**

**(فرانسوا – ریڤێر).**

## 1. سه‌رهه‌ڵدانی ره‌خنه‌ی مۆدێرنی رادیكاڵ له هه‌نگاریا

له وڵاتانی په‌یمانی ڤۆرشۆی [پێشـو] ره‌نگـه تـه‌نیا لـه هـه‌نگاریا دایـه كـه جۆرێك ره‌خنه‌ی چه‌پ و رادیكاڵ به‌تایبه‌ت له ڕه‌هه‌ندی تیۆریـدا، زۆرتـرین په‌ره‌ی سه‌ندووه.

له په‌یدابوونی ئه‌م چـه‌په مۆدێرنـه‌دا ده‌كرێ دوو ئاسـتی ره‌خنـه لێك جیاكه‌ینه‌وه. یه‌كێ له‌م ئاستانه ره‌خنـه‌ی تیـۆری كۆمه‌لگایـه، كـه له‌سـه‌ر بنه‌مای سیستمی به‌ها ماركسیه‌كان راوه‌ستاوه.

ئەم رەخنە تیۆریکە توانیویە لە ساڵەکانی شەست دا بپشکوێ، لە سەردەمێکا کە شانسی ئەوەی هەبووە کە بتوانێ ئەندێشەکانی خۆی بەیان بکا و بڵاوی کاتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەم کارەی بەشێوەیەکی بەرتەسك بێت (بەڵام لەچاو ئاستەنگەکانی سۆڤیەت تارادەیەك کراوەیە). ئاستەکەی تری رەخنە ئالۆزتر و تەماوییترە: چەمکی بەها رادیکاڵە مارکسیەکان– کە لە خۆڵەمێشی ئایدیۆلۆژی رەسمی بوژێندراوەتەوە. (ئەم ئایدیۆلۆژییە ئایدیۆلۆژییەکی دەسکرد و رزیوە کە لەودا ئەو بەهایانە کە خزمەت بە بەرژەوەندی تایبەتی توێژی بیرۆکرات دەکەن لەجیاتی بەها مارکسییەکان جێگیر بوون). ئەم بوژاندنەوەی بەها مارکسیەکان (کە لە بنەرەتدا دژی بروکراسییە) هەموو کۆڕ و کۆمەڵی لاوانی ناڕازی و ناسازگار لەگەڵ بەها زاڵەکان دەگرێتەوە.

بەڵام لاوان بەگشتی (بێجگە کەمینەی رەخنەگر و کەمینەی بەرزەفڕ) هێشتا وەك بەرەکانی پێشو لە نێو داوی بەهاکانی بەرهەمی رۆژاوا[97] دا گیریان کردووە. ئەم بەهایانە هەر ئەوانە بوون کە بەدرێژایی ماوەیەکی درێژ، بە هۆی خنکانی رەخنەی نێوخۆیی، رەخنەی هەنگاریای بۆ خۆی پاوان کردووە. بەهاکانی بەرهەمی رۆژئاوا (بە کەڵکوەرگرتن لەو دۆخە دەگمەنە کە دەسەڵاتی سیاسی بۆی رەخساندووە) لە رێگەی شەپۆلەکانی رادیۆوە (رادیۆ ئەورووپای ئازاد، دەنگی ئەمریکا) لە رێگەی کۆچ و سەفەرەوە، لە رێگەی کاڵا فەرهەنگیەکانەوە (سەرەڕای ئەوەی بە توندی کونترۆڵ دەکران) بۆ جەماوەرێکی بەرین لە خەڵك، پێشاندەری تاقە ئەلترناتیف[98] بوون کە ئەفسانە و خەونە یوتۆپیاییەکانیان لە ئاست فاکتی دوور لە هۆمێدی رژێمی دەسەڵاتدار، بەرهەست دەکردەوە.

[97] Made in Occident.
[98] Alternative.

دەرفەتێك كە بە ڕەخنەی نێوخۆیی درا تا بەشێوەی راشكاو روانگەكانی خۆی دەربڕێ — تا رادەیەك بە هۆی سیاسەتی یانوش كادار و گرووپی ئەو– مۆنۆپۆلی رەخنەی بەرهەمی رۆژئاوای هەڵوەشاندەوە. دەكرێ بەئاسانی وێنای بكەین كە سەرهەڵدانی رەخنەیەكی نەتەوەیی، بۆ كۆمەڵگەی هەنگاریا، بۆ خۆ چالاككردنی[100] ئەو، چەندین بەرئەنجامی گرنگی هەیە، بەتایبەت ئەگەر ئەم رەخنەیە بیتوانیبا بە دوور لە ئاستەنگە سەختەكان پەرەبگرێ.

لەم رەخنە نەتەوەییەدا، سروشتییە كە رەوتی چەپی مۆدێرن لە كەمینەدا بێت، رەوتی دیكە كە دەكرێ بەگشتی بە "تكنۆكراتیك"[100] ناودێر بكرێ ئەڵبەت گەلێ بەهێزترە، بۆوەی بەرژەوەندی (چەنلایەنە) و جیاوازی بروكراسی نوێنەرایەتی دەكات.

دەرفەتەكانی رەوتی تكنۆكرات بۆ رێكخستنی هێزەكانی لایەنگری ئاڵوگۆڕی كۆمەڵایەتی (بەتایبەت لە سیستمی سیاسی دیسپۆتیك دا) ئێجگار زیاتر لەو رەوتەیە كە خۆی بە نوێنەری چەپ و توێژی بەرفراوانی بێدەسەلات و بێئتۆریتە دەزانێ، یانی چەپی رادیكاڵی هەنگاریا.

بەهۆی دیسپۆتیزمی سیستمی سیاسی، دوو ئاستی رەخنەی رادیكاڵی چەپ قەت ناتوانن یەكبگرن و پێوەندی كۆمەڵایەتی و سیاسی گرنگ دابرێژن.

دەرفەتەكانی گرسان و بەرینبوونەوەی جۆری رەخنەی نەتەوی كە رەخنە رۆژئاوایەكان هێور دەكاتەوە، لە پاش هێرشی چەكدارانەی سۆڤیەت بۆ چێكسلۆڤاكیا، بە زۆری لە هەموو ولاتانی ئەوروپای رۆژهەڵاتدا قەدەغە كرا. ئەم دەستێوەردانە چەكدارانە نیشانەی سەرەتای بزاڤی

---

100 Auto dynamisme.
100 Technocratique.

گشتی سەکوت کردنی رەخنە رەسەن و نەتەوییەکانە لە هەموو بلوکی رۆژهەڵاتدا بوو، جێگایەك کە کۆنەپارێزترین هێزەکان هەست بە دڵگەرمی دەکەن. ئەم پرۆسەی کۆنەخوازییە کە ساڵی 1968 دەستی پێکرد، لەم دواییانەدا لە هەنگاریا (وڵاتێك کە پاش 1968، رەخنە و پرۆسەی رێفۆرمی ئابووری و کۆمەڵایەتی پێشی پێگیرا) لەمەڕ چەپی مۆدێرن، گەشەی زیاتری کردووە. گاڵتەی چارەنووس لەوە دایە کە خودی جۆرج ئاچل، بەرپرسی فەرهەنگی حیزب، و ئەستێرەی هەڵبژێردراوی دنیای فەرهەنگی هەنگاریا (کە بۆ پارتی کۆمۆنیستی ئیتالیا و پارتی کۆمۆنیستی فەرانسا بەتایبەت ئێجگار خۆشەویستە) لە وتارخوێندنەوەیەکی توند و تیژدا، هێرش دەکاتە سەر "پاشگەزبووەکان" "شۆڕشگێڕە رواڵەتییەکان"، "وردە بورژوازی رۆمانتیك" "رڤیزیۆنیستەکان" و "ئانارشیستە چەپە نوێکان" کە رۆڵێکی"بەشێوەی بەرهەست کۆنەپەرستانە"یان هەبووە و بەشێوەی "مەیمون ئاسا لاسایی ئایدیۆلۆژی بورژوازی دەکەنەوە". ج. ئاچل دەستەواژەی چەپی مۆدێرنی زۆر بەکاربردووە، ئێمە لە جیاکردنەوەی چەپی نوێ لە چەپی کۆن لەگەڵ ئەودا هاودەنگین. ئێمەش ئەم وشانە و چەندین وشەی دیکە وەك چەپی رادیکاڵ بۆ سادەیی باسەکەمان بەکار دەبەین، بەڵام لە هەمان حاڵدا لە ئاستی رواڵەتی بوونی ئەم جۆرە ناتۆر هەڵبەستنانە ئاگادارین، بێ ئەوەی بزانین ئایا کەسانی ناودێرکراو قەبوڵی دەکەن یان نا.[101]

هێرشی ج. ئاچل نیشانەی سەرەتای فەزای پۆلیسی و زەبر و زەنگێکە کە بە شیمانەی زۆر هەڵوێستی "دژە مارکسیزمی" تاوانبارکراوان

[101] تاوانبار کراوان بریتین لە: ماریا مارکوش و ئاندراش هگدوش (کۆمەڵناس) میهای وایدا و ئاگنش هلێر (بیرمەند و شاگردی لوکاچ). جۆرج ئاچل لە کونفرانسی راگەیاندن و پروپاگەندەی فەرهەنگیدا کە رۆژانی 24 و 25ی 1973 لە بوداپێست بەڕێوەچوو، ناوی ئەوانی هێناوە.

دەسەلمێنێ و بەخێرایی دەبێتەهۆی قەدەغەبوونی ئازادی بەیان و چاپەمەنی و پێش بە چالاکی زانکۆکان و کۆڕی وتارخوێندنەوە دەگرێ. هەروەها سەفەر بۆ هەندەران، بۆ هەر شوێنێك، قەدەغە دەکات. ئەم وتارە لە مارسی 1973دا نووسراوە. لەو کاتەوە، هەر بەوجۆرەی کە ڕۆژنامەکانی ڕۆژاوا نووسیویانە، زۆربەی تاوانبارکراوان لە حیزب دەرکراون و لەوەش خراپتر، کار و پیشەکانیان لێ سەندراوەتەوە. ئەمڕۆ ئەو کەسانە لەگەڵ زۆر دژواری بەرەو ڕوون و زۆربەیان ناچارن لە ڕێگی وەرگێڕانەوە ژیانیان ڕاپەڕێنن.

ئێمە بەپێی وتەکانی وتەبێژی سەرەکی ئەم کونفرانسە، جۆرج ئاچل، فەزای زاڵی کونفرانسەکە بە خوێنەران دەناسێنین. ج. ئاچل پاش دووپات کردنەوەی ناو و ناتۆرە باوەکانی کێرملین لەمەڕ پتەوکردنی ڕیزەکانی ئایدیۆلۆژیك، بەتایبەت چەپی نوێ، لە پلەی یەکەمدا هێرشی کردۆتەسەر تیۆری کۆمەڵایەتی ئەو (تاوانبارانی سەرەکی ماریا مارکوش و ئاندراش هێگدوشن). "ڕڤیزیونیزمی "چەپی نوێ" و ڕڤیزیونیزمی ڕاست، بە چەن دروشمێکی بەڕواڵەت شۆڕشگێڕانەوە کە وادەنوێنێ دوژمنی بورژوازییە، و هەندێ جار لە قاڵبی دەستەواژەی مارکسیستیدا ئاراستە دەکرێ لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ئەوەندە لایەنگری نییە. سەرەڕای ئەمەش، ئەم بۆچوونانە، هەر وەك ئەو فکرانەی کە لەڕووی سیاسییەوە پڕخەسارن و لەڕووی ئایدیۆلۆژیکەوە، درۆینەن، پیشاندەری یەك مەترسین، بەتایبەت لەمەڕ کۆڕ کۆمەڵی بەرفراوانی لاوان." (بڕوانە بۆ نامیلکەیەك لەمەڕ کونفرانسەکە کە دەزگای پەخشی Kossuth لە تیراژی 50.000 دانەدا بڵاوی کردۆتەوە). ئاچل چەپی نوێ تاوانبار دەکات کە "ڕۆڵێکی بەرهەستی دواکەوتوانە"ی هەیە و لە ڕۆژئاوا بەپێچەوانەی سەندیکا و پارتە کۆمۆنیستییەکان (!!)، لەنێو "سیستمی بورژوازیدا تواوەتەوە"(!)

بەپێچەوانەی بابەتی ڕۆژئاوا، "ڕەخنەی وردەبورژوازی ڕادیکاڵی "چەپی نوێ" لە هەنگاریا نیشانەی قەیران نییە". ج. ئاچل لە وتارەخوێندنەوەی خۆیدا هەروەها دەڵێ لە هەنگاریا ئاکاری نزم، ڕۆحیەی وردە بورژوازی و عەیش و عشرەت خوازی بەرەی لاو نەفرەت هێنەرە. کەوابوو دەتوانین تێبگەین کە باشترین بەشی لاوەکان ئەم ڕەوشتە نزمانە لێبڕاوانە ڕەت دەکەنەوە. بەڵام ئەم شۆڕشە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە دەتوانێ زۆر پڕخەسار بێت ئەگەر لاوەکان و خەڵکی تر بەشێوەی ئاقڵانە لەئاست ئەم دیاردانەدا بەرەنگاری نەکەن. ئەم تیۆرییە بەڕواڵەت شۆڕشگێڕانە، بۆیە مەترسی هێنەرە کە (...) جۆرێک ناسیاسی کردن، و "نائایدیۆلۆژی کردن" پەرە پێدەدات، چونکە خۆی بە شکەستی حەتمی ئیدانە کراوە".
ج. ئاچل بەتایبەت لە ماریا مارکوش و ئاندرە هێگدوش ڕەخنە دەگرێ و دەڵێ: "بەڕای ئەوان ئەمڕۆ لە وڵاتانی سۆسیالیستیدا نە سیستمی سۆسیالیزم، بەڵکوو پرۆسەی "مۆدێرنیزاسیون"[102] لەئارادایە (...) پرۆسەیەک کە ئەگەر دووبارە خاوەنداری تایبەتی ئامێری بەرهەمهێنان دانەمەزرێنێ، بەهەر حاڵ کۆمەڵگەیەک دەخولقێنێ کە ئینتمای بەرەو سوود و قازانج هەیە و داوای خاوەنداری دەکات". سەرەڕای ئەمەش: "خاڵێک زۆر ڕۆشنە: هەموو ئەم بابەتانە لەگەڵ مارکسیزم و لەگەڵ ئامانجی سۆسیالیزم هیچ پێوەندییەکیان نیە." ئەم باسە "هەم لە قالبی ئایدیۆلۆژیکی و هەم لە قالبی زانستی سەرتر چووە و ئیتر هیچ قازانجێکی نیە. سەبارەت بەم ڕەوتە ڕڤیزیۆنیستییە وا باشترە وتەیەک لە لوکاچ بێنینەوە: (...)". بەدبەخت لوکاچ، کە لەپاش مەرگی لە 1971دا ڕژێمی دەسەڵاتدار وەک ئامێر کەڵکی لێ وەردەگرێ و بۆ پاساودانی سەرکوتکردنی شاگردەکانی بەڵگەشی لێدێنێتەوە!

[102] Modernisation.

لێرەدا پێویستە لەگەڵ تیۆری کۆمەڵناسانەی چەپی رادیکاڵی هەنگاریا زیاتر ئاشنا بینەوە. گرنگترین کاری کۆمەڵناسانەی چاپ کراوی چەپی هەنگاریا، بەرهەمی ئاندرە هێگدوش و ماریا مارکوشە کە زۆر جار پێکەوە کاردەکەن و بەرهەمی هاوبەش دەنووسن. بەمبۆنەوە ئەم تۆژینەوەی ئێمە لەسەر نوسراوەکانی ئەوان تەرکیز دەکات.

بۆچوونی ئێستای ئەم نووسەرانە بەتایبەت لە دەیەی 60دا پێکهاتووە و، بەگشتی ئەوانیش وەکوو هەموو چەپی نارەسمی[103]، لەپاش رووداوەکانی 1968ی فەرانسا و چێکسلۆڤاکیا رادیکاڵتر بوونەتەوە. یەکێ لە سەرچاوەکانی تیۆریك و ئایدیولۆژیکی هەرە گرنگ بۆ روانگەی ئەوان، بێگومان قوتابخانەی بوداپێستە کە جۆرج لوکاچ دامەزرێنەری بووە. قوتابخانەی ناوبراو سەرەتا زیاتر خەریکی فەلسەفە بوو. کۆمەڵناسانی رادیکاڵی هەنگاریا، پاش کاریگەری ئەم قوتابخانەیە، بەجۆرێك دەستیان دایە"کۆمەڵناسانەکردنەوەی"[104]. چونکە ئەم قوتابخانەیە بەتایبەت سروشتی مەرامی هەیە و سیستەمە بەهاییەکانی ئەم کۆمەڵناسانە، لە سیستمی بەهایی ئەم مەکتەبە ئێجگار نزیکە، دەکرێ ئەوان بە ئەندامانی مەکتەبی بوداپێست حساب بکەین کە ئەڵبەت بەمجۆرە پانتایی ئەم مەکتەبە کۆمەڵناسیش دەگرێتەوە. هێرشی ج. ئاچل بەگشتی لەسەر ئەم قوتابخانەیە چەقی بەستووە و تێدەکوشی دامەزرێنەری قوتابخانەکە، یانی لوکاچ لە قوتابخانەکە جیابکاتەوەو بە قازانجی رژێم بەکاری بێنێ. ئەم جۆرە بەکارگرتنەی رەخنەگرانی رژێم لەپاش مەرگیان، پیلانێکی کۆن و ئێجگار ناسراوە (بڕوانە بۆ یەکەم لاپەڕەی دەوڵەت و شۆڕش!). لوکاچ لەدوا ساڵەکانی تەمەنیدا زۆر رادیکاڵ بووبوو، ئەو ئیتر لوکاچی پێشوو نەبوو. بەڵام ئێستا رژێم تەنیا دەیەوێ ئەو بەجۆرێك پیشان بدات کە ئەو

[103] Non-orthodoxe.
[104] Sociologisation.

بەردەوام رەخنەگرێکی نەرم و نیان و میانەڕەو بووە. یان وابنوێنێ کە قوتابخانەی بوداپێست لە سەردەمی لوکاچ دا وەك ئەمڕۆ رادیکاڵ نەبووە.

تایبەتمەندی سەرەکی قوتابخانەی بوداپێست چییە؟ سروشتی سەرەکی ئەم قوتابخانەیە (کە تایبەت بە خۆی نییە) هەڵوێستی رەخنەگرانەی ئەوە لەئاست تیۆری و پراتیکی کۆمەڵگە سوسیالیستییەکان (بەتایبەت لە ئەوروپای رۆژهەلات)دا، هەڵوێستێك کە لەسەر سیستمێك لە بەها مارکسییەکان و لەسەر شروڤەی زیندووی فاکتی بەرهەست راوەستاوە. دەکرێ ئامۆژگاری لوکاچ وەك دروشمی سەرەکی ئەم مەکتەبە لەقەڵەم بدەین: "بۆ دەرکی مارکسیزم "بزاڤێکی دوو لایەنە" پێویستە: لەرووی مێتۆدۆلۆژیکەوە پاشەکشە بەرەو مارکس و، لەمەر ئەوەی بە فاکت دەناسرێ، پێشرەوی بەرەو شرۆڤەی مارکسیستی دیاردەکانی هەنووکە".[105] بێگومان ئەم چەند دێرە بۆ پێناسەکردنی هەمەلایەنەی ئەم بزاڤە فکرییە گونجاو نیە و، هەموو لایەنەکانی ئەم بزاڤە رۆشن ناکاتەوە.

## 2. لەمەڕ سرووشت و تایبەتمەندی کۆمەڵگەی بلوکی رۆژهەلات

لەم بابەتەوە، تیۆری پێکهاتەی بروکراتیك، پێگەیەکی ناوەندی هەیە. تیۆری ماکس ڤێبر (و لەم دواییەشدا تیۆرییەکانی رێکخستن) لە بۆچونی کۆمەڵناسانی رادیکالی هەنگاریا لەمەڕ بروکراسی کاریگەری تایبەتی هەبووە. ئەوان بەم ئاکامە گەیشتوون کە کێشەکانی کۆمەڵگەی بلوکی سۆسیالیستی، تەنیا لە چەندین هۆکاری دەرەکی، زەینی و شەخسی و

---

[105] گفتوگۆ لەگەڵ لوکاچ لەمەڕ"هەندێ لە پرسەکانی هاوژینی تەبایانە" (بە زمانی هەنگاری):Kortars (Budapest) n 5 (mai) 1968

"کەمتەرخەمی"[106] یان لە خەیانەتی دەسەڵاتدارانەوە سەرچاوە ناگرێ، بەڵکوو ئەم پرسانە زیاتر بەرهەمی چەند هۆکارێکی بنەمایین و لە ئەنجامدا، لەگەڵ گەوهەری خودی پێکهاتەی ئابووری – کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتانە پێوەندییان هەیە. کەوابوو، وەها کۆمەڵگەیەك لەگەڵ ئەو سوسیالیزمەی کە چەندین بەرە لە شۆڕشگێڕان بە دڵ و گیان خەباتیان بۆ کرد، جیاوازی بنەڕەتی هەیە. کۆمەڵناسانی رادیکاڵی هەنگاریا، کۆمەڵگەی وڵاتانی بلوکی سۆسیالیستی بە جۆرە کۆمەڵگەیەکی تازە دەزانن کە نە سەرمایەدارییە و نە هیچ سیستمێکی کۆمەڵایەتی– بنەمایی کە بەپێی خاوەنداری تایبەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان پێکهاتبێ. ئەم کۆمەڵگا هەر ئەو شتەیە کە مارکس بە فۆرماسیونێکی کۆمەڵایەتی نوێ ناودێری دەکرد. ئەو بەپێچەوانەی هەندێ مەزەندەی وشیارانە نەیتوانی سەرهەڵدانی ئاوا کۆمەڵگەیك پێشبینی بکات.

بەشێك لە ئاشقانی بێهەتوانی کاربردی رەهای چەمك و دەستەواژەی دامەزرێنەرانی مارکسیزم لە توێژینەوەی کۆمەڵگەی هاوچەرخدا پێیان وایە بەو کەشفە گەیشتوون کە ئەگەر سەرئەنجام بە سۆسیالیزم نەگەین، بەناچار بورژوازی سەقامگیر دەبێت. سەرەڕای ئەمەش، ئەم رەخنەگرانەی بلوکی ئەورووپای رۆژهەڵات، تاقە رەخنەگرانێکی رادیکاڵن کە بە سیستمی بەها مارکسییەکان وەفادار ماونەتەوە. بەڵام شەیدایی فۆرماڵیستانەیان[107] بە سیستمی چەمکی مارکسیستی، ئەوانی لە رۆشتن بەرەو تاقە مۆدێل کە دەربازبوون لە بنبەستی تیۆری (و پراکسیسی) شۆڕشگێڕانەی سەردەم هەموار دەکات، دوور راگرتووە: چەسپاندنی شۆڕشی پێویست بۆ پچڕانی حەتمی لە سیستمی بروکراتیك، تەنانەت ئەو کاتە کە ئەم پێکهاتە خۆی بە مارکسیستی دەزانێ و، لە هەمان حاڵدا

[106] Dysfonction.
[107] Formaliste.

پاراستنی پرنسیپی مارکسیستی. تەنیا بەمجۆرە دەکرێ یارمەتی بە خولقانی بزاڤێکی کۆمەڵایەتی بکرێت کە ئیتر پاشکۆی پێکهاتەی بروکراتیك نەبێت و بەپێی نەریتی تا ئەمڕۆ باو بە بنبەستی بروکراتیك نەگات. تەنیا شۆڕشێکی تیۆریك لە نێو ئەم نەریتە فەرهەنگییە مارکسیستییەدا دەتوانێ بەشێوەی ڕیالیستی (هەرچەند ژاناوی) شارستانیەتی هەنووکە بنرخێنێ، وەها شۆڕشێك کە بناغەی بەرنامەی ڕاستینی گۆڕینی بنەرەتی کۆمەڵگا بێت، وەها شۆڕشیك لەگەڵ ئامانجە ڕەسەنەکانی مارکسیزمدا سازگارە. نووسەرانی ئەم وتارە پێیان وایە کە تۆژینەوەی کۆمەڵگەی بروکراتیك یان ڕوو لە بروکراسی (کۆمەڵگەی سەنعەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا) لە ژێر تیشکی شروڤەی ڕەخنەگرانی هەنگاریادا دەتوانێ زۆر دەرس و ئەزموون وەرگرێ. هەرچەند ئەم بەرنامەیە هێشتا زۆر سەرەتاییە، بەڵام دەکرێ زۆر بەرنامەی شۆڕشگێڕانەی لێ ساز بکرێ و بەتایبەت لەمەڕ کۆمەڵگەی پیشەسازی زۆر یارمەتیدەر بێت.

" بروکراسی لە مێژووی مرۆڤدا لە قۆناغێکی تایبەت لە دابەشبوونی کاردا سەری هەڵدا، لە کاتێکدا کە کارکردی چەسپاندنی مافی خاوەنداریی و چەسپاندنی ڕێبەری [کار و باری] کۆمەڵایەتی لەژێر کاریگەری بارودۆخی [کۆمەڵایەتی]دا هەم لە ملکداران جیابوونەوە هەم لە بەرهەمهێنەرانی ڕاستەوخۆ، یانی چینە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا. لە کاتێکدا کە لێکبەستراوی[108] کۆمەڵایەتی بە وەها ئاستێك گەیشت کە بۆ ئەنجامدانی وەها کارکردێك، پێویستی بە پێکهێنانی ڕێخراوەیەك بە پێکهاتەی زنجیرە پۆست و پلەی پسپۆڕانەوە هەبوو کە پسپۆڕێتی[109] بەکار ببات. بزاڤی بنەڕەتی لەم پرۆسە کۆمەڵایەتیە ئاڵۆزەدا ئەوەیە کە

[108] Integration.
[109] Technicite.

خاوەن — چ یەك كەس بێت یان گروپێكی كۆمەڵایەتی بێت— ناتوانێ كاروباری بەڕێوەبەری ئەنجام بدات. ئەو دەبێ دەسەڵاتی خۆی لەگەڵ گروپێك كە شایستەیی ئەنجامدانی وەها ئامانجێكی هەیە، دابەش بكات. ئەم گرووپە خاوەن زنجیرە پۆست و پسپۆڕە لە هەمان حاڵدا بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی دەگەڕێ."[110]

پێكهاتە (یان سیستمی كۆمەڵایەتی) بروكراتیك لە "شێوەی بەرهەمهێنانی ئاسیایی"دا دەسەڵاتدار بووەو لە ئەمپراتۆریە گەورەكانی دیكەی چاخی كەوناراردا ڕۆڵی گرنگی گێڕاوە. ئەم سیستمە لە ڕێكخراوە بەرینە ئاینیەكاندا زاڵ بووە و لە سیستمی دەوڵەتیدا و لە پرۆسەی سانترالێزمی سیاسیدا كە لە كۆتایی كۆمەڵگەی فیودالیدا بە دەوڵەتی دیسپۆتیك گەیشت ڕۆڵی سەرەكی هەبووە و وەك دەزانین پیكهاتەی بروكراتیكی ئەم دەوڵەتە، زۆر ڕەهەندی بەرفراوانی لێكەوتۆتەوە.

ژیاری پیشەسازی لەوە بەدوا زۆر ڕێخراوی بەرفراوانی لە سیستمی ئابووری دا وەك پێویستی هێناوەتە ئاراوە. ئەم ڕێكخراوانەش، كە سیستمی بەڕێوەبەرییەكی هەرە ئاڵۆزیان هەیە، پێكهاتەی بروكراتیكیان پێكهێناوە كە تاقە پێكهاتەیەكە كە توانای بەڕێوەبەری وەها كۆمەڵگەیەكی هەیە. هەنووكە، تایبەتمەندی هاوبەشی هەموو كۆمەلگا سەنعەتییەكان، تەنانەت جیاوازترینیشیان، ڕۆشتن بەرەو ڕێخراوی گەورەی بروكراتیكە. تاقە ڕێخراوەیەك كە توانای بەڕێوەبردنی هێزەكانی بەرهەمهێنان مۆدێڕنی هەیە بەگشتی و بەشێوەی هەندێجار شێنەیی — هەندێجار ریشەیی — هەموو پێكهاتەكانی دیكەی مناسباتی كۆمەڵایەتی لە بەشەكانی ژیانی كۆمەڵایەتیدا لادەبەن تا خۆیان ببن بە پێكهاتەی زاڵ.

[110] Andreas Hegedus: "Marx sur les bases de la bureaucratie"… (Budapest), Avril 1966, p.214.

"بێگومــان دەتــوانین بڵــێین کــە بــە بــێ بۆچــوونی کۆمەڵناســانە لــە بروکراسی[111]، یـان بـە وتەیـەکی هەمەلایەنـەتر، بـەبێ دەرکـی مناسـباتی بروکراتیك کە هـەم لـە دەروونـی سیسـتمی بـەڕێوەبردنی پێوەندییـەکان و هەم لە نێوان سیستمی ئیدارەی کارەکـان و تێکـڕای کۆمەڵگـەدا پێکـدێت، نــە دەتــوانین لــە بــورژوازی بۆچــوونێکی ریالیســتیمان هــەبێت نــە لــە سۆسیالیزم"[112].

تۆژینــەوەی ڕێگــای مێــژوویی و ڕەوتــی بروکراتیزەبــوونی ئــەورووپای ڕۆژهەڵات، لە دۆخی فەرهەنگی سیاسی هەنگاریادا زۆر ئەسـتەمە، چـونکە ئازادی ئەندێشە و بەیان لەئارادا نیە. لەم وتارەدا تێدەکۆشین روانگەیەکی گشتی (هەرچـەند ناتـەواو) لـە تیـۆری ڕەوتـی مێـژویی وڵاتـانی ئـەورووپای

[111] نابێ ئەم بۆچوونە لەگەڵ روانگەیەك وەك یەك بزانین کە بروکراسی بە لقێکی کۆمەڵایـەتی تایبـەت لـە پێکهاتـەی بروکراتیك دەزانـێ، بۆ نموونـە: سیسـتمی دەوڵـەتی، یـان تـەنیا ئـەو ڕێخراوانە بە بروکراتیك دەزانێ کە بە سستی و "کەمتـەر خـەمی" کاردەکەن. هەندێ لە بۆچـوونەکانی هەنووکـە لەمـەڕ پێکهاتـەی بروکراتیـك، لەگـەڵ بۆچـوونەکانی ئـەم وتـارە هاوشــێوەن و تــەنیا چــەند وشــەیەکی جیــاواز بــەکار دەبــەن، وەك: تکنۆبروکراســی، تکنۆکراسی و تکنۆستراکتور و هتاد.

[112] A. Hegedus: "Marx sur les bases de la bureaucratie" p. 213.
دەبـێ بـزانین کـە کـاتی چـەپی رادیکـاڵی هـەنگاریا، چـەن وشـەیەك وەك سۆسـیالیزم یـان سـەرمایەداری بـەکاردەبات، مەبەسـتی لـەحنی بەهاناسـانەی بێلایەنانەیـە. سـەرمایەداری تەنیا بۆ ئەو کۆمەڵگایانە بەکاردەبات کە ملکداری یاسایی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان لەواندا پارێزراوە، سەرەڕای ئەمەش لـە هـەمان دەقدا لەگەڵ کاربردی وشەی سۆسیالیزم بە دوو مانــای هــەرە جیــاواز بــەرەوروو دەبــین: مانایــەك کــە پیشــاندەری کۆمــەڵگای بــەناو سۆسیالیستی هەنووکەیە و مانایەك کە پیشاندەری پرۆسەی ئازادبوونی مرۆڤە بە مانای مارکسی وشەکەیە...

ڕۆژهەڵات ئاراستە بکەین و لە هەمان حاڵدا هەندێ لە ئالۆزییەکان ڕۆشن بکەینەوە.

یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی قوتابخانەی بوداپێست پێداگری قوول لەسەر ئەم تێزەیە کە خودی مرۆڤ، لە ڕێگەی کار و تێکۆشانییەوە، خۆی وەك مرۆڤ دەخولقێنێ و بەمجۆرە مێژووی تایبەت بەخۆی دەئافرێنێ. کەوابوو مرۆڤ و مێژووی ئەو، پێڕەوی حەتمی یاسا ئابستراکت و گشتییەکان نین، یاسایەك کە سەرتر لە خەباتی واقعی مرۆڤەکان و گرووپە کۆمەڵایەتییەکان بێت، خەباتێك کە ئاراستەی ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی لە دوا ساتدا دیاری دەکات. ئەم ئەندێشە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی1920، تەنیا بەهۆی لوکاچەوە گەڵاڵە نەکراوە، بەڵکوو لەگەڵ گرامشی و کارل کورش[113] یش پێوەندی هەیە. ئەمڕۆ قوتابخانەی بوداپێست ئەم ئەندێشەیە ئاوا بەیان دەکات: "چ بۆ تاکی مرۆڤ و چ بۆ بەرەی مرۆڤەکان، فەزایەکی بەشێوەی بەرهەست ئاراستە کراو کە بە دۆخێکی ئامادە سنووردار کراوە، بازنەیەك (بەپێی سەردەم، کەم تا زۆر بەرفراوان) لە دەرفەتەکان و بژاردەکانی[114] گەشەی [مێژوو]. مرۆڤ لەنێوان ئەم دەرفەتانەدا دەست دەداتە هەڵبژاردن، کۆمەڵێك هەوڵ و تێکۆشانی ئینسانی یەکێ لەم بژاردانە دەچەسپێنی، کۆمەڵە تێکۆشانێك کە چەندین هۆکاری بێئەژماریان هەیە، زۆرجار هۆکاری ڕێکەوتەکان کاریان تێدەکەن و وشیارانە یان ناوشیارانە لێکبەستراون. مرۆڤ، بەپێی وتەی لوکاچ، بونەوەرێکی "دەربەستە". ("بونەوەرێك کە وڵام دەداتەوە") کە بەردەوام لە ئاست بژاردەکانی بەرهەمی گەشەی کۆمەڵایەتی دژەکردەوە

[113] Karl Korsch.
[114] Alternative.

پیشان ئەدا و دەتوانێ رەوتی خۆرسکی ناکۆکی گەشەی مێژوو بکاتە چەندین پرسیار کە وڵامی وشیارانەیان بۆ بدۆزێتەوە."[115]

لە یەکەم ساڵەکانی پاش شۆڕشی ئۆکتۆبر، بەگشتی سێ بژاردە لەمەڕ گەشە [ی کۆمەڵگە] ئاراستە کرابوو:[116]

یەکەم بژاردە کە هی تروتسکی بوو یەکەم ساڵەکانی پاش شۆڕشی ئوکتبر ئاراستە کرابوو (لەگەڵ بژاردەی ساڵانی دواتری تروتسکی تەواو جیاواز بوو). ئەم بژاردە پێکهێنانی کۆمەڵێکی سانترال لە دام ودەزگای ئیداری، کۆمەڵێکی یەکپارچە و سەرەڕۆی پیشنیار دەکرد کە چاودێری کرێکاران بەسەر ئەودا ئیمکانی نەبوو. دواتر ستالین ئەم بژاردەیەی پراکتیزەکرد و ئەمڕۆ هەموو وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات خاوەنی ئەو خەسڵەتە بنەڕەتییەن، هەرچەند لەچاو سەردەمی ستالین ئەم رەوتە هێور بۆتەوە. لە دۆخی دواکەوتوانە و گەمارۆی کۆماری ساوای سۆڤیەتدا، ئەرکی باشکردن[117] و گەشەی چەندی ئابووری، گرنگی زیاتری پێدرا و هەموو ئەرکی ئینسانیکردن[118] و چاککردنی مناسباتی کۆمەڵایەتی گرنگی پلە دووی پێدەدرا. پاشەکەوتی بەخێرایی پێویستی بە دام و دەزگای بروکراتیك بۆ ئیدارەی کۆمەڵگا[119] هەبوو، چەندین سیستم بە پێکهاتەی قەتیس و نەگۆڕەوە کە خۆیان لەگەڵ قازانجی کۆمەڵایەتی گشتی هاوتا پیشان ئەدا و لە بەرژەوەندی تایبەت نکوڵییان دەکرد. "هەر کە خەڵکی زەحمەتکێش بە دەسەڵات گەیشت، دەوڵەت، چونکە دەوڵەتی

[115] Georges Markus: "Discussions et Courants dans la philosophie marxiste" (en hongrois), Kortars, (Budapest), juillet 1968.
[116] A. Hegedus: "sur les alternatives du developpement Social"..
[117] Optimisation.
[118] Humanisation.
[119] A. Hegedus:"Relation bureaucratique et socialism"…

زەحمەتکێشانە، تـەنیا بەرژەوەنـدی زەحمەتکێشـان دابـین دەکـات." بـە وەهـا دروشمێکـی کلێشـەیی ئـەم بـژاردە دەس پێـدەکات. بـەپێی ئـەم دروشمە ئەوان راستەوخۆ بەو ئاکامە دەگەن کە هەر جـۆرە رەخنـەگرتنێك لەم دەوڵەتە و هەروەها هەر چەشنە رەخنەیەك لە دام و دەزگـای رێبـەری کۆمەڵگا، رەخنەیەکی دژی گەلی و دژ بە شۆڕشە. ئەم سیستمە سیاسـییە دیسـپۆتیك و پـاوانخوازە، پێکهـاتنی کۆمەڵایـەتی هـەر رەوت و بزاڤێکـی فکری سەربەخۆ قەبووڵ ناکات. ئەگەر ئەم دیاردە لە سەرەتادا، پـێش بـە دینامیزمی کۆمەڵگایەکی روو لە گەشەی بـەرفراوان ناگرێـت، هـەر کـە ئـەم گەشەیە زیاد دەکات و پێویستی بە رێفۆرم و چاکسازی بنەمایی هەیـە کـە لاسایی رووتی وڵاتانی پێشکەوتوو ناتوانێ وڵامـدەرەوەی ئـەو بێـت، وەهـا دیاردەیەك لەئاست دینامیزمی کۆمەڵایەتی وەك لەمپەرێکی قورس و بەهێز دەردەکەوێ.[120]

لە سەردەمی ستالیندا، تیۆری رەسمی مارکسیسـتی زیـاتر لـە پێشـوو سادە و سـاویلکانە دەبێـتەوە، رۆڵـی کۆمەڵایـەتی مـەعریفی یـان رەخنـە لـەخۆ گـرتن لـە دەسـت ئـەداو لـە رۆڵـی بـەرگری و پاسـاوداندا دەردەکەوێت.[121] ئەگەر ئـەم کـارە لـە سـەرەتادا دەیتـوانی بـۆ مانـەوە و کارکردی سیستمی نوێ، گرنگی مێژوویی– کۆمەڵایـەتی تایبـەتی هـەبێت، بە تێپەڕینی کات و بە سەقامگیربوونی سیسـتمی تـازە، ئـەم تیۆرییـە زۆر زیاتر پارێزکارانە دەبوو و بە وتەیەك بەتەواوی لە راستییەکان جیا دەبۆوە و دەمامکێکی "مارکسیستی" بە سیستمی ئەو بەهایانە ئـەدا کـە پـێ بـە پێـی دامـەزران و سـەقامگیربوونی بنـەما ئـابووری و کۆمەڵایەتییـەکانی

[120] M. Markus et A.Hegedus: "Modernisation and the alternatives of social progress"…

[121] A.Hegedus: Lautocritique de la socite Socialiste, en tant que realite et necessite, in Etudes sociologiques ouvrage collectif publie sous la direction de A. Hegedus…

دەسەڵاتی بروکراتیك، بەشێوەی بەرفراوان لە بەرژەوەندی جەماوەر جیا دەبووەو زیاتر لە پێشوو، بەشێوەی تایبەت و کۆنەپەرستانە دەردەکەوت.[122] پاش بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت، ئایدیۆلۆژی رەسمی تێکۆشاوە جۆرێك "نوێکردنەوە" ئەنجام بدات. "یەکێ لە باوترین فۆرمەکانی ئەم "نوێکردنەوە" ئەوەیە کە ئایدیۆلۆژی رەسمی تێدەکۆشی کە خۆی بە چەمك و بنەمای کۆمەڵناسانە ساغ بکاتەوە، ئەڵبەت نە بەجۆرێك کە ئایدیۆلۆژی رەسمی تووشی مەترسی بکات...

دووهەمین بژاردە کە لە یەکەم ساڵەکانی شۆڕشی ئوکتۆبردا ئاراستە کرا، بژاردەی "ئۆپۆزیسۆنی کرێکاری" بوو. ئەم ئۆپۆزیسۆنە خوازیاری ئەوە بوو کە بەرێوەبەران لە هەموو ئاستەکانی بەرێوەبەری ئابووریدا (سەرۆك کرێکارەوە بگرە تا وەزیر) دەبێ هەڵبژێردراوی کرێکاران بن. ئەم ویستە "سەندیکایی کردنەوەی دەوڵەت" لەئاست بژاردەی یەکەم "دەوڵەتیکردنی سەندیکاکان" گرنگی بەو پرسانە نادات کە زوجوێب[123] و رۆزا لوکزامبورگ[124] و روبەر میشل[125] ماوەیەك دواتر لەمەڕ برۆکراسیزەبوونی رێخراوە سەندیکاییەکان ئاراستەیان کردووە. ئینتما بۆ بروکراسی، بەو ئەرکە ئێجگار بەرینەوە کە بەرئەنجامی بەمجۆرەی سەندیکایی بوونەوەی دەوڵەت و ئابوورییە، بەناچار گەشەی دەکرد. ئەم دووهەم بژاردە لە ئەزموونی یوگسلاڤیادا دوای ساڵی 1948 بەشێوەیەکی

[122] A.Hegedus et M. Markus: Les tendances principales du developpement de la sociologie marxiste dans les pays socialiste…

[123] Webb

[124] Rosa Luxembourg.

[125] Robert Michels.

ناتەواو بەکار براوە. تیۆری و پراتیکی خۆ–ڕاپەڕاندنی[126] یوگسلاڤیایی لە هەمان حاڵدا کە بانگەشەی هەڵوەشاندنەوەی "ناوەندێتی بروکراتیک" دەکات، بەرواڵەت دەسەڵاتی بەڕێوەبەری بە "ڕێکخراوە کرێکارییەکان" سپاردووە و بەمجۆرە، پێویستی پێکهێنانی دەسەڵاتی بروکراتیکی لە تیۆریدا ڕەتدەکردەوە. خاڵی بەهێز و لاوازی ئەو لەمە دایە کە هاوشێوەیی خۆڕایی بەرژەوەندی دام و دەزگای بروکراتیک و بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگەی خستۆتە ژێر پرسیار. سەرەڕای ئەمەش خۆڕاپەڕاندنی یوگسلاڤیایی لە بواری پێکهێنانی دام و دەزگای بەڕێوەبەری بیروکراتیکدا ئەزمونێکی وشیارانەی دەستەبەر نەکردووە و نەیتوانیوە چاودێری کرێکاران لەسەر بروکراسی مسۆگەر بکات. خودموختاری یوگسلاڤی ئەم وێنایەی پەرە پێداوە کە دەتوانێ بروکراسی بسڕێتەوە. بەڵام هەر بەو جۆرەی کە چەندین توێژینەوەی بێئەژماری کۆمەڵناسانە بەرۆشنی پیشان ئەدەن، بەڕێوەبەری بروکراتیك، بەشێوەی حاشاهەڵنەگر لەودیو دەمامکی دام و دەزگای خودموختارەوە بەنهێنی پێکهاتووە. بروکراسی بەمجۆرە توانیویە تا ڕادەیەکی زۆر بێتاوان خۆبنوێنێ و ئەرکەکان بخاتە ئەستۆی دام و دەزگا خودموختارەکان کە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان پاساو ئەدەن و تەنانەت دەیشارنەوە، هەر ئەم کارەش، خەباتی کارساز و واقعی لە دژی بروکراسی و بە قازانجی خودموختاری کرێکاری ڕاستین دژوارتر دەکات.

بژاردەی سێهەم کە چەپی ڕادیکاڵی هەنگاریا (هەر ئێستاکە) بۆ دارشتنی تیۆریکی ئەو تێدەکۆشێ لە ئەزموونەکانی دوو بژاردەی پێشوو سود وەردەگرێ، ئەزموونێك کە دەبێ لەبەر تیشکی پێشکەوتنێکی بەریندا توێژینەوەی لەسەر بکرێ، کە زانستی کۆمەڵایەتی لە نیوەی

[126] Autogestion.

دووهەمی سەدەی بیستەمدا لەو سودی بینیوە(بەتایبەت ئەو زانستانەی کە بەجۆریك بە پرسەکانی بەڕێوەبەری کۆمەڵگاوە خەریك دەبن).

ئێستا بە پرسیارێکی سەرەکی گەیشتووین کە -بەرای ئێمە- کۆمەڵناسی رادیکاڵی هەنگاریا توانیویە وڵامێکی رەسەنی پێبداتەوە. رەنگە ئەم وەڵامە زۆرێك لەو و خەیاڵاتە بسڕێتەوە کە رۆڵی بەرهەستیان تەنیا خزمەت کردن بە بەرژەوەندی هەندی گرووپی بروکراتیکە.

سەرەتا دەبێ گرنگی بەرینی کۆمەڵ- مێژووناسانەی پێکهاتەی بروکراتیك بناسینەوە. ئەگەر نکۆڵی لە گرنگی ئەم پرسە بکەین توێژینەوەکەمان قسر دەردەچێ. پاشان دەبێ ئاستەنگە حەتمییەکان و پێویستی ئەو بناسینەوە و دواتر گەڵاڵەی چاودێری خەڵك لەسەر پێکهاتەی بروکراتیك دابڕێژرین تا سەرئەنجام پرسی چارەسەرکردنی پێکهاتە بروکراتیکەکان ئاراستە بکرێت.

بژاردەی تازەی پێشچوونی کۆمەڵایەتی، بەپێی سیستمی بەها مارکسییەکان، دۆخێکی ئابوری- کۆمەڵایەتی دەبێت کە تا رادەیەکی زۆر بۆ مارکس شیاوی پێشبینی نەبوو.

بەرنامەی ئەم بژاردە:

لەلایەکەوە قەبوڵ دەکات کە بەڕێوەبردنی هەموو دەڤەرە گرنگەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بە دام و دەزگای پسپۆڕانە، لە بەراورد لەگەڵ بەڕێوەبەری ناپسپۆڕ، رێگەچارەیەکی خێراتر و کارسازترە. کەوابوو، بەرئەنجامی حەتمی گەشەی کۆمەڵایەتی لە قۆناغی ئێستای گەشەی مێژوودا، پێکهێنانی دام دەزگای پسپۆڕانەی بەڕێوەبەری کارەکان، لەگەڵ بەرژەوەندی، مەبەستەکان و هێزە تایبەتەکان دایە.

لەلایەکی ترەوە بۆئەوەی ئەم جۆرە سیستمەی بەڕێوەبەری پسپۆڕانە، بەگشتی جۆرێ بەرژەوەندی تایبەت لەئاست بەرژەوەندی

کۆمەڵگا هەموار دەکا و هەروەها، هاوکات لەگەڵ ئەم بەرژەوەندییە تایبەتە، بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەسەڵاتی مەهارنەکراوی هەیە، بە هەر حاڵ، بەرنامەی ناوبراو، پێکهێنانی مناسباتێکی کۆمەڵایەتی بە پێویست دەزانێ کە دەبێ ئەم سیستمی بەڕێوەبەری پسپۆڕانە پێڕەوی ئەو بن.

بە وتەیەکیتر، بابەتی سەقامگیربوونی مکانیزمی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی لەسەر دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە ئارادایە. مارکس کۆمەڵگەیەکی دوور لە دەسەڵاتی بەدوا ئامانجی خۆی زانیوە، بەڵام تا دەسەڵات هەبێ ئامانجەکەی مارکس ناچەسپێ. تا کاتێ وەها دۆخێك نەڕەخسێ، جۆرێك دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی پێویستە. ئەمڕۆ دەسەڵاتێکی واقعی لە دەست بەڕێوەبەرییەکی پسپۆڕدا چەقی بەستووە. بەرئەنجامی هەوسارپچڕاوی ئەم دەسەڵاتە، کۆمەڵێکی بەرین لە مەترسی و دیاردەی نگەتیڤە کە تەنیا بە چاودێری کاریگەری کۆمەڵایەتی چارەسەر دەبێ. ئەم پرسانە بۆیە ئاڵۆزتر دەبن چونکە (لە دوو بژاردەی ناوبراودا) لە جۆراوجۆرترین رەهەند و ئاستەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، چەندین ئامێری ئیدارەی پسپۆڕانەی ئێجگار سەقامگیر پێکدێن کە فەن و زانیاری بەڕێوەبەری بۆ خۆیان پاوان دەکەن و تەنانەت چەندین مێتۆدی کۆمەڵایەتی – دەروونی ئێجگار زراڤی شکڵ پێدان بە رەفتاری مرۆڤەکانیش دەناسن.

ئاندرە هێگدوش دەڵێ نوتفەی ئەم دوا بژاردەیە لە نیوەی یەکەمی دەیەی 1920 لە ئەندێشەی لێنین دا پەیدا دەبێ، بەڵام بە ئاشکرا بەیان ناکرێ. لەراستیدا، لێنین لەئاست دوو بژاردەی دەوڵەتیکردنی سەندیکاکان و سەندیکایی کردنی دەوڵەت، و لەئەنجامدا لەئاست بژاردەی بروکراسی زەبەلاح و هەوسارپچڕاو سیستمێکی کارساز و سەقامگیری بانگەشە

دەكرد كە كرێكاران لەئاست ئەودا دەرفەتی داكۆكی لە مافەكانی خۆیان هەبێ و چاودێری كرێكاری لەسەر ئەو ئیمكانی هەبێت. ئەم كارەش، لە ئاسۆی پرۆسەی چاودێری روولە گەشەی كرێكاراندا دەبێ بەجۆرێك بەئەنجام بگات كە زۆربەی ئەوان بە یارمەتی فەرهەنگ و ئەزموونی بەڕێوەبەری رووڵەگەشەی خۆیان بتوانن قۆناغی چاودێری پەتی تێپەڕ بكەن و لە بەڕێوەبردنی كۆمەڵگەدا دەوری ئەكتیڤ و راستەوخۆ بگێڕن تا بەمجۆرە، بەڕێوەبەری مدیرانی پسپۆڕ كە بەدرێژایی تەمەنیان تیۆری و پراتیكی بەڕێوەبەری بۆ خۆیان پاوان دەكەن بێسود بكەن.

ئاندرە هێگدوش و ماریا ماركوش لە توێژینەوەیەكی تازەتردا، رەوتەكانی گەشەی كۆمەڵگەی ناسراو بە سۆسیالیستی ئەورووپای رۆژهەڵات لە روانگەیەكی نەختێ جیاوازترەوە راڤەدەكەن. "لەمەڕ ئەو شتەی لەگەڵ ئەندێشەكانی داهاتوو و فاكتەكانی گەشە پێوەندی هەیە، لانیكەم دەتوانین دوو رەوتی سەرەكی گەشە و ساغبوونەوە لە ولآتانی ئەورووپای رۆژهەڵاتدا بەدی بكەین". مۆدێلی یەكەم كە لە رێگەی یاسا و شێوازە رەسمییەكانەوە رێبەری و كاریگەری خۆی دەچەسپێنێ، "مۆدێلی دەوڵەتی" یە. ئەم مۆدێلە، پێكهاتەكانی ئەمڕۆ بەسەر داهاتووشدا تەعمیم دەدات و هەرچەند كە دەتوانێ و هەندێ جار لەگەڵ هەندێ لە ئاڵوگۆڕەكان خۆی سازگار بكات، سەرەڕای ئەمەش مۆدێلێكی بەراستی ئەكتیڤ نیە. مۆدێرن كردنەوە، تەنانەت ئەگەر بە بەرتەسكترین مانا راڤەبكرێت، پێویستی بەوەیە كە سیستم نە تەنیا بەردەوام بگۆڕدرێ، بەڵكوو هەروەها توانای ئاڵوگۆڕێكی هەبێ كە لە سنوورەكانی خۆی سەرتربچێ. ئەم مۆدێلە لە سەردەمی گەشەی بەرفراوان و قات و قڕی كالآكاندا پێكهاتووە. سەرەڕای ئەمەش، سۆسیالیزم بە هەموو شكڵ و شێوازە باوەكانی لەم سەردەمەدا وەك یەك دەزانێ. بەمهۆیەوەیە كە ئەم

مۆدێله له وڵاتانێك که گەشەی چروپڕ لەجیاتی گەشـەی بـەرفراوان جـێگیر بووه، به خەستی کەوتۆتەبەر رەخنەوه. ئەم رەخنەیـه لـه قـاڵبی رێفـۆرم (بەتایبەت رێفۆرمی ئـابووری)دا بـەیان کـراوه. "سـەرەڕای ئەمـەش وەهـا رێفۆرمێـك لـه زۆر بابەتـەوه (...) تـەنیا تێکۆشـاوه رێگەچـاره کۆنـەکان مۆدێرن بکاتەوه.

بـژاردەی دووهــەم، بـژاردەی "شـاڕێ" "بەشـێوەی راسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ ئـەم ئـەم فکـره بـەیان دەکـا کـه دەبـێ وڵاتـانی ئـەورووپای رۆژهەڵات رێگـای وڵاتـانی رۆژئـاوایی پێشـکەوتوو بگرنەبـەر". بـەپێی ئـەم بۆچوونه، رادەی گەشـەی ئابوورییـه کـه جـۆری دروسـتی شـێوەی ژیـان، نیازەکان، پێکهاتەی بەرهـەمهێنان و بـەکارهێنان، شـێوازەکانی چـاودێری رێکخستن و هتاد دیاری دەکات.

مشـت و مـڕی نێـوان لایـەنگرانی دوو بـژارده لەسـەر رۆڵـی پێوەنـدی کاڵاکان له دەڤەری بەرهەمهێنان و بەکارهێنان و لەسـەر پرسـی رێبـەری و رێخستنی ژیانی ئابووری چەقی بەسـتووه. لایـەنگرانی "شـاڕێ" مـۆدێلی یەکەم به قەتیس و بێسەمەر دەزانن. ئەوان بەرژەوەندی سوودی شـاراوه له بازاڕدا به هێزی بزوێنەری سەرەکی بەرهەمهێنان و سەرئەنجام به تاقـه رێگەی گەشەی ئەکتیڤ دەزانن. کەوابوو پێیان وایه که گەشه و دامرکـانی رەوتـەکانی "خاوەنـداری خـواز"ی مـرۆڤ گـرنگترین بزوێنـەری رەفتـاری ئابوورییه. ئەوان گەشـەی مناسـباتی کـاڵایی بـه تاقـه رێگـەی سـڕینەوەی سانترالیزم و تا رادەیـەکی تایبـەت دیمـوکراتیزەکردنی دەسـەڵاتی ئیـداری دەوڵەت له رێبەری بەرهەمهێناندا دەزانن. ئەم گەشـەیه – بـەڕای ئـەوان– دەبێ بەئەنجام بگات تا ئازادی هەڵبژاردن له مەسـرەفی شەخسـیدا بـەرین بکاتەوه، کارێك که کاریگەری پۆزەتیڤی لەسەر بەرهەمهێنان هەیه.

ئەم بەڵگاندنە کاتی نزیکبوونەوەی رەوتی گەشەی وڵاتانی ئەورووپای رۆژئاوا لە رەوتی گەشەی وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات – کە لەگەڵ کەمبوونەوە بەرەورووو بووە– بە هەر حاڵ بەهێز دەکرێت.

ئەم بژاردەیە تکنۆکراتیک یان فەنسالارانەیە ئەڵبەت چەندین رێگەچارەی بۆ دەربازبوون لە کێشەکانی زادەی "دەوڵەتگەرایی" ئاراستەکردووە. – کێشەکانی سەمەرەی کەمبوونی کاڵاکان کە بەرهەمی نائەقڵانیەتی ئابووری، ئاستەنگەکانی ئازادی تاك، شێوازەکانی ژیانی داسەپێندراوی دیسپۆتیك و شتی ترن. سەرەرای ئەمەش، دووهەم بژاردە، ئەگەرچی زۆر سەرەنجراکێشە، بەڵام روون نیە کە بە بواردان بە مۆدێلی شێوەژیانی وڵاتانی پێشکەوتوو، و بە زیادکردنی جیاوازی چینایەتی نێوان گرووپە کۆمەڵایەتییەکان، بەختەوەری حەتمی جەماوەر دابین بکات.

### 3. بەرەو شۆڕش لە شێوەژیاندا، بەرەو جڤاتێکی نوێ

لای مارکس بەهایەکی بنەڕەتی هەیە کە روونکردنەوەی ئەو بۆ بەرنامەی شۆڕشگێرانەی چەپی نوێی هەنگاریا زۆر گرنگە. ئاگنش هلێر دەنووسێ: "من سوور دەزانم کە مارکس یاسایەکی ناسراوی بەهای گشتی[127] ئاراستە دەکرد کە دەکرێ هەموو بەهاکان و هەموو داوەریە بەهاییەکان[128] دەتوانن لەڕووی بەهاناسانەوە لەو هەڵبهێنجرێن. ئەم بەها بنەڕەتییە، یەکەم کاتێگوری ئانتۆلۆژیکە (کە ناکرێ لە کاتێگورییەکی تر هەڵبهێنجرێت)، ئەم بەهایە "سامانداری"[129] یە. سامانداری یانی "

---

[127] Axiomes de valeur universels.
[128] Jugement de valeur.
[129] Richesse.

پشـکووتنی هەمەلایەنـەی هـەموو هێـزە گەوهەرییـەکانی ڕەگـەزی مـرۆڤ. یەکەم یاسای ناسراوی بـەهایی: بـەها بریتیـە لـە هـەر شـتێ کـە پاشـکۆی هێزە بنەڕەتییەکانی ڕەگەزی مرۆڤ بێ و هەر شتێ ئەم هێزانـە دەوڵەمەنـد بکاتەوە. دووهەمین یاسـای ناسـراو: سـەرترین بـەها ئەوەیـە کـە تاکـەکان دەتوانن ساماندارى ڕەگەزی مرۆڤ بۆ خۆیان ببەن. مارکس هەموو بەهاکان لەم دوو یاسا بنەڕەتییەوە هەڵدەهێنجێ."

لە ڕوانگەی چەپی ڕادیکاڵی هەنگاریادا، یەکێ لە پرسە بنەڕەتییـەکانی گەشەی هەنووکە، پرسی پەیدابوونی فـۆرمێکی تـازە لـە ژیـانی ئینسـانی کراوە (کە نابێ لەگەڵ چەمکی "هیۆمانیزاسیۆن"[130] کە تیۆری مناسـباتی ئینسـانی[131] یـان تیۆرییـەکانی تـر بـەکاری دەبـەن تێکـەڵ بکـرێ) کـە بەستێنی گەشەی هەمەلایەنەی تاك بێت. ئەم شێوازە نۆیـەی ژیـان دەبـێ ئەو دەرفەتە بۆ تاکەکان بڕەخسێنێ تا بەپێی هەڵبژاردنێکی وشـیارانە بـۆ ژیانی تایبەتی خۆیان بڕیار بدەن.

کۆمەڵناسانی هەنگاری بڕاردەیـەك هەڵدەبـژێرن کـە دەبـێ بـە دەسـتی بزاڤێکی جـەماوەری بـەرفراوان بچەسـپێندرێ و نابـێ ئامـانجی ئـەم بزاڤـە جێگیرکردنی گرووپێك لە ئلیتەکان لەجیاتی گـرووپێکیتر بێـت، کارێـك کـە لەرووی کۆمەڵایەتییەوە زۆر بەئەستەمی تەواو دەبـێ و ئاکـامی کارەکـەش سـەرئەنجام هـەمان شـت دەبێـت: تـەنیا ئـەو کرێکـار و ڕوناکبیرانـەی کـە خۆیـان بەشـێوەی حـەتمی دەبنـە گرووپێکـی برۆکـرات، جێگـەی گرووپـی برۆکراتی پێشوو دەگرنـەوە. کـەوابوو ئامـانجی ئـەم بزاڤـە کۆمەڵایەتییـە، چەسپاندنی چاودێری کارسازی جەماوەر لەسـەر کارکردەکـانی بروکراسـی دەبێت نە داگیرکردنی ئـەم کارکردانـە. لـە ئەنجامـدا دوائامـانج، پرۆسـەی

[130] Humanisation.
[131] Human Relation.

گشتی "ئینسانیکردنی" دۆخی ژیان و مناسباتی کۆمەڵایەتی دەبێت، پرۆسەیەك کە لەگەڵ رەوتی بەشداری ئەکتیڤ و بەردەوامی مرۆڤەکان لە رێبەری و ئاراستەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتیدا... پێوەندی قووڵی هەیە.[132]

لە دیدگای گەشەی کۆمەڵایەتیدا، "گرنگترین پرس ئەمەیە کە زاڵبوون لەسەر رەوتەکانی کۆمەڵگای "مەسرەفی بەرفراوان" لە شتشێوەیی[133] دا کە لە بنەرەتدا ئازادی تاك لە بژاردنی "شت و مەکی" حازر و ئامادەدا و لە هەڵبژاردنی کاڵا جۆراوجۆرەکاندا بەرتەسك دەکاتەوە، ئایا گەشەی هەمەلایەنەی تاکەکان هەموار دەبێ یان نا ئەگەر ئا، بە چ شێوەیەك؟ ئایا شکڵ و فۆرمی کۆمەڵایەتی کە بزوێنەری گەشەی تاك بن و ئەو بەرەو بەها ئینسانییەکان رێنوێنی بکەن، پێکدێن، یان نا؟"[134]

لە وڵاتانی ئەورووپای بەناو سۆسیالیستی کە لەواندا شێوەی ژیانی ناسراو بە "کۆمەڵگەی مەسرەفی" ئەمرۆ "لە روانگەی بەشێکی بەرین لە کۆمەڵگەدا، وەك گیراترین مۆدێلی گەشە خۆ دەردەخات– مۆدێلێك کە بەوهۆیە گرنگی زۆر پەیدا دەکات کە شیوازە تازەکانی ژیانی پێکهێنەری بەها سۆسیالیستییەکان نە لە تیۆریدا بەدی هاتوون و نە لە پراتیکدا" ئەم شێوە ژیانە کە لە درێژەی هەموو پرۆسەی خەبات بۆ"ئینسانی کردن" و بۆ "دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی" شکڵ دەگرێت، لە پراتیکدا بوونی نیە. تەنانەت ئەگەر مۆدێلی "شارێ" "ژیانێکی ئاسوودەتر بۆ خەڵك دابین بکات (بەڵام خاوەنداری تایبەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان دووبارە سەقامگیر نەکات) رەنگە لەگەڵ پەیدابوونی کۆمەڵگەیەکی سوودخواز،

---

[132] M.Markus et A. Hegedus: Communaute et individu (en hongrois). Kortas. 1970, n 12(decembre). Page 1933.
[133] Chosification
[134] Ibid, p. 1925.

کۆمەڵگەیەکی خاوەنداری خواز هاوکات بێت". [135] خەبات بۆ شێوەژیانی نوێ خەباتێکە بۆ "گۆڕینی بنەڕەتی" کۆمەڵگەی بەناو سۆسیالیستی و "چەسپاندنی پراتیکی ئەم مۆدێلەی گەشەی سۆسیالیستی نابێ پێڕەوی بڕیارەکانی حکومەت بێت (تەنانەت ئەگەر حکومەت لە خۆی نیازپاکی پیشان بدات) بە بێ داهێنان و تێکۆشانی جەماوەر هەموار نابێت". [136]

لە گەشەی کەسێتی مرۆڤدا، کار، ڕۆڵی بنەڕەتی دەگێڕێ. ئەمڕۆ کار، بەشێکی بەرین لە ژیانی هەموو مرۆڤەکان دەگرێتەوە. ئەمڕۆ کاری تاکەکان و جێگای ئەوان لە دابەشبوونی کۆمەڵایەتی کاردا– زۆر زیاتر مافە قانوونیەکانی ملکداری تاکەکان یان نەبوونی ئەم قانوونە– جێگای ئەوان لە پێکهاتەی کۆمەڵگا و سەرئەنجام سیستمە بەهاییەکان، بەرژەوەندی، شێوەکانی ژیان، مەیل و ئینتماکان، و بەکورتی ژیانی ئەوان بەشێوەی بنەڕەتی دیاری دەکات. کاری کۆمەڵگەی هاوچەرخ، کارێکی لەخۆنامۆیە، دابەشبوونی کۆمەڵایەتی کار، زۆربەی تاکەکان لە گەشەی وزە و تواناکانیان بەپێی کار [137] و لە چاودێری لەسەر پرۆسەی

135 bid, p.1927.

136 M. Markus et A.Hegedus: "Modernisation…

137 ئاگنش هلێر دەنووسێ:"لەخۆنامۆیی (...) لەوەدا نیە کە وزە و تواناییەکانی تاکەکان نەتوانن بپشکوێن، بەڵکوو لەمە دایە کە ئەم تواناییانە یەکلایەنە بپشکوێن (دابەشبونی کار ئەم تواناییانە "دابەش دەکات"). هەروەها لەخۆنامۆیی لەم بوارەش دایە کە چینە کۆمەڵایەتیەکان بەتەواوی دەرفەتی گەشەی هەندێ لە تواناییەکانیان لە ئاستێکی بەرزتردا نیە. هەر بەمهۆیە، هێشتا ئێمە بە ساماندای "ڕاستین" نەگەیشتووین، هەرچەند ئەم قۆناغانەی گەشە، مەرجی مێژوویی — و پێویستی ئەوە. "چونکە ساماندای ڕاستین، هەر هەمان توانایی بەرهەمهێنانی هەر تاکێکە" (مارکس). لەم ڕوانگەوە، لەخۆنامۆییش تەنیا ناسازگاری نێوان گەوهەری تیپێك و ژیانی تاکی نیە، بەڵکوو بەشێوەی هەمەلایەنەتر، ناسازگاری نێوان سامانداری تیپێك و سامانداری تاکییە. لە ڕوانگەی مارکسدا، کۆمۆنیزم تەنیا کۆمەڵگەیەك نیە کە لەودا سامانداری تاکەکان بپشکوێن، بەڵکوو کۆمەڵگایەکە کە لەودا سامانداری تاکەکان دەتوانن بۆ خەڵك (بۆ

بەرهـەمهێنان و گەشـەی کۆمەڵایـەتی دوور رادەگـرێ. بـەپێی هەنـدێ لـە روانگـەکان، دەکـرێ لـە دەرەوەی کـار، بـەبێ ئـاڵوگۆڕی بنـەڕەتی کـار و رێخستی کار، بە گەشـەی هەمەلایەنـەی کەسـێتی تاکـەکان بگـەین. ماریـا مـارکوش و ئانـدرە هێگـدوش لـەڕووی کۆمەلناسـانەوە دەیسـەلمێنن کـە "کاتی ئازاد و شێوەی کار، پەیوەندییـەکی تونـدوتۆڵیان پێکـەوە هەیـە و بەمهۆیەوە، پێکهاتنی ئاڵوگۆڕی قووڵ لـە یەکیانـدا، بـەبێ گـۆڕینی ئـەویتر ئیمکـانی نیـە". بـەمجۆرە تـەنیا زیـادکردنی "کـاتی ئـازاد" یـانی کـاتی بێکاری، لەو بوارانـەدا کـە تـا ئـەمڕۆ چەسـپێندراون، بـە ئاکـامی گـەورە و بەرین ناگات. "ئەزموونی واقعی و تۆژینەوەی کۆمەڵناسانە پیشان ئـەدەن کە تەنیا زیادبوونی کاتی بێکـاری هێشـتا شـێوە ژیـانی خـەڵك نـاگۆڕێ و، ئەوپەڕەکەی تەنیا دەرفەتی گەشە و پەرەگرتنی هەنـدێ کـار و تێکۆشـان دەڕخسێنێ، تێکۆشانێك کە بۆ دابینبوونی ئەو پێویستییانە بەکار دەبرێت کە لە ناخی ئەو شێوە ژیانە تایبەتەدا، لە هەموو توند و تیژترن."[138] چۆن دەتوانین پەیوەندی هەمیشەیی و بەستراوەی تاك لەگـەڵ کـارێکی تایبـەت لەنێوببـەین یـان لانیکـەم کـەمی بکەینـەوە؟ بـەرای ئـەم نووسـەرانە ئەنجامـدانی وەهـا کارێـك پێویسـتی بـە جۆریـك سیسـتمی پـەروەردە و رێخستنی کار هەیە، "کە جێگـای تـاك لـە دابەشـبوونی کـاردا بـە درێـژایی هەموو ژیانی، قـەتیس نـەکات، بـەڵکوو ئـەو بـەرەو پشـکنینی بـەردەوامی خۆی رێنوێنێ بکا و دۆخێکی سازگار پێکبێنێ تا کرێکار لە هـەر قۆناغێـك لـە ژیانیـدا بتوانـێ پسـپۆڕی و دەڤـەری تێکۆشـانی خـۆی

---

هەموان!) وەك ئامانجێکی گەوهەری دەرکەون (...) بەوهۆیە تاك "هەژار دەکات" چونکە تـەنیا بەشـێك لـە تواناییـەکان (بـە زیـانی ئـەوانی تـر) گەشـە پێـدەدات، دەوڵەمەنـدی هەستەکانی مرۆڤ لە یەك هەستدا کورت دەکاتـەوە: هەسـتی "داگیرکردن"و تواناییـەکانی مرۆڤ تەنیا بەهۆی دابینکردنی ژیان هەموار دەبن"(hypothesee, p. 773).

[138] بروانە بۆ ئاندرە هێگدوش و م. مارکوش: کاتی ئازاد و دابەشبوونی کار.

بگۆڕێ". [139] بەپێچەوانەی سیستمی پەروەردەی هەنووکە کە تەنیا تاك بۆ کارێکی تایبەت باردێنێ و زانست تەنیا وەك ئامێرێك بۆ گەیشتن بە دۆخێکی کۆمەڵایەتی بانتر دەزانێ – دەبێ سیستمێکی پەروەردە پێکبێت کە لە پاڵ پەروەردەی پسپۆڕانەدا، وەها فەرهەنگێکی گشتی دروس بکا کە تاکەکان بۆ زاڵبون لەسەر مناسباتی کۆمەڵایەتی، بۆ بەدەستەوەگرتنی چارەنووسی خۆیان، ئامادەبکات. لە روانگەی سیستمی زاڵدا، ئەم جۆرە سیستمەی پەروەردە قەبووڵ ناکرێت: مرۆڤەکان بە گەشەکردنی جدی ئاستی فەرهەنگی گشتی خۆیان زیاتر لە پێشوو ناڕازی دەبن و لەئاست کاری خۆیان و کۆمەڵگە بەگشتی هەڵوێستی رەخنەگرانە دەگرن. سەرەڕای ئەمەش – بە وتەی ئەم نووسەرانە – چونکە ئەم رەخنە و نارەزایەتییانە هەم لە رێکخستنی کاردا و هەم لە کۆمەڵگادا پێویستی ئاڵوگۆڕێکی ئەکتیڤ دینە ئاراوە، ئێجگار پۆزەتیڤ دەبن.

لێرەدا و لە نرخاندنی دیالکتیکی کۆمەڵگای بروکراتیکدا بە بابەتێکی بنەڕەتی گەیشتووین: ئایا ئەم رەخنەیە، نرخاندنی هەمان شتە کە مارکس و ئنگڵس بە کۆمەڵگەی چینایەتی ناودێریان دەکرد؟ یانی کۆمەڵێك کە ئێمە دەتوانین ئەو بە دوو بەش ناودێر بکەین چونکە دابەشبوونی دوالیتەی کار لەم کۆمەڵگەیەدا (دەستەیەك بەڕێوەبەرن و دەستەیەك فەرمانبەرن و گرووپی یەکەم لەم دۆخەدا بەهرەمەند دەبن و مناسباتی کۆمەڵایەتی بەپێی بەرژەوەندی خۆیان رێك دەخەن) لە دواین ساتدا، بناغەی دابەشبوونی ئەو بەسەر ئەو گرووپانە دایە کە کێشمەکێشی کۆمەڵایەتی نێوان ئەوان هەمیشەیی و (لەرووی پێکهاتەوە)حەتمییە. بەداخەوە ئەم بابەتە هێشتا لە بەرنامەی دژی بروکراسی کۆمەڵناسانی رادیکاڵی هەنگاریادا دەرنەکەوتووە... شۆڕشی دابەشبوونی کار کە دەبێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی پاوانخوازی بەڕێوەبەری (کە نە هەر تایبەتمەندی

[139] هەمان سەرچاوە.

کۆمەڵگای بروکراتیك، بەڵکوو هەموو کۆمەڵگا دوو پارچەکانە) ئەنجام بدرێت، تاقە بنەمایەکە کە بەپێی ئەو، پرۆسەی "دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی"و "ئینسانیکردنی" مناسباتی کۆمەڵایەتی دەتوانێ بە باشی بەئەنجام بگات. تا کاتی ئەم دوو پارچەییە لەئارادایە، ئەوپەڕی تەنیا شتێ دەتوانێ خۆڕاگرێت کە ئالێن تورین[140] ئەو بە "بەشداری ملکەچانە"[141] ناودێر دەکات... بەرای ئێمە ئەم بەرنامەیە ئێجگار گەشبینانەیە، بەتایبەت سەبارەت بە دەرفەتی چاودێری و کۆنترۆڵی کرێکاران بەسەر دام و دەزگای بروکراتیکدا(وە هەروەها بەسەر چەندین دەزگای بەم رادەیە بروکراتیك ... کە دەبێ دام و دەزگاکانی تر کونترۆڵ بکەن، کونترۆلێك کە تێکۆشانێکی بەرین و ئالۆزە و سەرئەنجام بۆ خۆی پێویستی بە پێکهاتەیەکی بروکراتیك هەیە) ئەویش لە کۆمەڵگەیەکدا کە بە هەر رادە دام و دەزگاکانی دیموکراتیك بن، لە بنەڕەتدا بە دوو پارچەیی دەمێننەوە. سەرەڕای ئەمەش ئێمە پێمان وایە کە وتاری "کاتی ئازاد و دابەشبوونی کار" یەکەم هەنگاوە بەرەو چارەسەرکردنی پرسەکە: دامەزراندنی بناغەیەکی پتەو بۆ گەلاڵی "دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی".

یەکێ لە پرسە گرنگەکان لە شۆڕشی شێوە ژیاندا، بێگومان پرسی بنەماڵەیە.[142] لە کۆمەڵگەی لەخۆنامۆی ئەمڕۆدا یەکێ لە ئەرکە سەرەکییەکانی بنەماڵە، بارهێنان و ئامادەکردنی بەرەی نوێیە بۆ کۆمەڵگەی داهاتوو، یانی دروستکردنی وەها کەسێتییەك کە لەگەڵ دۆخی کۆمەڵگەی لەخۆنامۆ، بەتەواوی سازگار بێت. منداڵ لە سەرەتای

---

[140] Alain Touraine، کۆمەڵناسی فەرانسی (لەدایکبووی 1925)، ئەو بە تۆژینەوەی مناسباتی کار لە پێکهاتەی پێوەندی کۆمەڵایەتیدا، تێکۆشاوە بنەماکانی کۆمەڵناسی سەنعەتی بەپێی "پراکسیس" شرۆڤە بکات – و.

[141] Parttcipation dependante.

[142] A. Heller et Mihaiy Vajda: Forme familiale et communisme, (en hongrois). Kortars,1970, n 10 (octobre).

لەدایکبوونیەوە لەگەڵ پێکهاتەی زنجیرەیی و دیسپۆتیك (سەرەڕۆ)ی بنەماڵە خوو دەگرێ کە زەمینەی رۆشتن بۆ نێو کۆمەڵگەی بەرینتر ئامادەدەکات، کۆمەڵگەیەك کە بنەماڵەیەکی گەورەی هەر لەوچەشنە پێکدێنێ. بارودۆخ لە رۆژاوا یان لە رۆژهەڵاتدا، لەمەر پەروەردەی کەسانی تەواو سازگار، هەم لەنێو بنەماڵە و هەم لە دەرەوەی بنەماڵە(قوتابخانە، مەس میدیا، و هتاد)دا بەستراوە، لە بنەرەتدا وەکوو یەکە. بنەماڵەش یەکەیەکە کە لەودا بەگشتی، راستەوخۆترین پەیوەندی لەنێوان ژن و پیاودا هەیە، پەیوەندیەك کە وەکوو پەیوەندییە ئینسانییەکانی تر لەخۆنامۆیە. لەم پەیوەندی لەخۆنامۆیەی نێوان ژن و پیاودا، یەکێ لە بزوێنەرە سەرەکیەکان هەر هەمان داگیرکردن و لە بەرچاوگرتنی ئەویدی وەك ئامرازی بەدەست هێنانی پرستیژە.[143] ئەگەرچی لە کۆماری ساوای شوراکاندا هەوڵدرا ئەم چەشنە بنەماڵەیە بنرخێندێ، [بەڵام] بە گەیشتنی سەردەمی ستالین، بەشێوەی ناوشیار تێگەیشتن کە بنەماڵەی دیسپۆتیك، بناغەیەکی گرنگە بۆ کۆمەڵگەی دیسپۆتیك و دیسان فۆرمی بنەماڵەی بورژوایی سەقامگیر کرایەوە. پاشان "لە سەردەمی پەیدابوونی وڵاتانی دیکەی سۆسیالیستیدا، گۆڕینی فۆرمی بنەماڵە، قەت بەرنامەی دەوڵەتان نەبوو."[144]

شۆڕش لە ژیانی رۆژانەدا لەگەڵ شۆڕش لە فۆرمی بنەماڵە یان مناسباتی گشتی نێوان ژن و پیاودا پێوەندی قووڵی هەیە. سەرەڕای ئەمەش رەنگە شۆڕش لە شکڵی بنەماڵەدا(و شۆڕش لە ژیانی رۆژانەدا) بەر لە ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لە هەموو کۆمەڵگادا دەس پێبکات. هەر ئێستا زۆرێك لە لاوان شێوەژیانی بنەماڵەکانیان کە لەسەر دەسەڵات، پرستیژ، خاوەنداری، هاوڕەنگی لەگەڵ کۆمەڵگە، و هتاد راوەستاوە، تێدەپەڕێنن و

[143] A. Heller: Sur lavenir des relation enter les sexes,...
[144] A. Heller et Mihaiy Vajda: Forme familiale…, p. 1660.

بە پێکهێنانی کۆمۆنەکان، "بنەماڵەی بورژوایی تاك هاوسەری"یش رەتدەکەنەوە. ئەم خاڵە، پێویستی فۆرمێکی تازە لە ژیان پیشان ئەدات.[145] رێبەرانی هەنگاریا لەگەڵ ئەم دیاردەیە ناکۆکن و لەگەڵ لاوانی هەنگاری –کە لە لاوانی وڵاتانی "برا" ئازادی رێژەیی زیاتریان هەیە– کەوتوونەتە کێشەوە.

ئاگنش هلێر و میهای وایدا پێیان وایە ئەوەی دەسەڵاتداران بانگەشەی دەکەن یانی پەروەردە لەنێو کۆمەڵگای تاك هاوسەری، کۆیی و "سەنعەتی"دا ناتوانێ "دەسەلاتی کۆمەلایەتی" بچەسپێنێ و کەسێتی تاکەکان بپشکوێنێ. بەڵکوو ئەوە کۆمۆنە کە میراتداری بنەماڵەی بورژواییە کە نە لە پێگەی کۆمەڵی هاوبەشی ئابووری یان سیاسیدا، بەڵکوو لە پێگەی "ناوەندی رێخستنی هاوژینی رۆژانەدا" بە وەها ئامانجێك یارمەتی دەکات. کۆمۆن بەرەیەکی نوێ باردێنێ و لە هەمان حاڵدا زۆر کەسێتی جیاواز و ئازادمەنش دەخولقێنێ کە هیچ زوڵم و زۆرێك قەبووڵ ناکەن و دەس دەکەن بە رەخنەگرتن و نارەزایی و کوێرانە پێرەوی ناکەن. بەڵکوو بەشێوەی وشیارانە و رەخنەگرانە هەڵدەبژێرن. "منداڵی کۆمۆن لەمەڕ داهاتووی ژیانی خۆی قسەی خۆی دەکا، بڕیاری خۆی دەدا، بەپێچەوانەی فەزای نێو بنەماڵەی دیسپۆتیك و تاك سلوولی، بە زوترین کات فێردەبێ، کە نایەوێت ئیرادەی ئەویدی پێشێل بکات". ئەم دەرفەتە دەرەخسێ کە مناسباتی ئینسانی لەمەڕ توانایی بژاردنی تاکەکان، ئازادتر بن و کەمتر خوو و رەوشتی نەریتی کاریان تێبکات. مناڵ ناچار نیە کەسانێکی تایبەت (بۆ نموونە خزمانی سروشتی) خۆش بووێ، بەڵکو ئەو خۆی کەسانێك هەڵدەبژێرێ کە خۆشی دەوێ یان بەپێچەوانەوە. لەمەڕ مۆدێلەکانی پەیوەندی سێکسی، ئەندامانی کۆمۆن دەبێ بەبێ پێشداوەری یەکتر هەڵبژێرن. لە روانگەی ژنیشدا، کۆمۆن تاقە

[145] بروانە بۆ: تیۆری و پراتیك بەپێی نیازە مرۆڤییەکان، ئاگنش هلێر.

ڕێگـەی چارەسـەر بـۆ هەلومەرجێکـە کـە هەرچـەند زۆرێـك لـە لەمپـەرە یاسـاییەکانی سـڕیوەتەوە، بـەڵام هێشـتا دوایـن لەمپـەر کـە زادەی دابەشـبوونی کـارە لـە بەرابـەری نێـوان ڕەگەزەکانـدا نەسـڕیوەتەوە. سڕینەوەی ئەم نایەکسانییەش لەخۆیدا بە سڕینەوەی نایەکسانیەکانیتری هەموو کۆمەڵگاوە بەستراوە و هـەموو ڕێگەچـارەیەکی بنـەڕەتی یـەکێ لـە نایەکسانییەکان، پێڕەوی چارەسەری بنەڕەتی کێشەیەکی ترە.

ڕەخنەی کۆمەڵایەتی چەپی نوێی هەنگاریا، هەرچەند زۆر ساوایە، بەڵام ئێستا لـەوە زیـاتر گەشـەی کـردووە کـە بکـرێ لێـرەدا هـەموو نـاوەڕۆکی دەربخەین...

لەم قـاقڕە بێبژاردەیـەدا کـە بـە کۆمەڵگـەی سۆسیالیسـتی ئـەورووپای ڕۆژهەڵات ناسراوە، سەرهەڵدانی ڕەخنەی ڕادیکاڵی چـەپ تاقـە هومێدێکـە کـە بـەهاکان و پراکسیسـی مارکسـی بتوانـێ پـاش نغرۆبـوون، یـان پـاش سەردەمێکی درێژ پێڕەوی لە گاڵتـەجاڕی مێـژووی پێکهاتـەی کۆمەڵایـەتی دوولـەت، دووبـارە ببوژێتـەوە. لـە کاتێکـدا لـە کۆمەڵگـەی ڕۆژئـاوایی پێشـکەوتوو و پلۆرالیسـتی ئێمـەدا، ئـەکتیڤیی کۆمەڵایـەتی بەشـێوەی گەشندە بە ڕەخنەکانی ئەم چەپە تازەیـە نیـازی هەیـە کـە تاقـە هێزێکـی بەراسـتی هـۆگرە کـە دەیـەوێ لـەڕووی تیـۆری و پراتیکییـەوە لەسـەر ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکان زاڵ بێت، لە کۆمەڵگـەی ئـەورووپای ڕۆژهەڵاتـدا، بەپێچەوانەوە، حکومەت لەجیاتی سوودوەرگرتن (بۆ بەرژەوەنـدی خـودی گرووپی بروکرات) لە هەندی لە ئەزموونەکانی ئەم ڕەخنەیە، پێـی باشـترە بە زەخـت و زۆر سـەرکوتی بکـات. ئایـا ئـەورووپای ڕۆژهـەڵات لـە بـەراورد لەگەڵ کۆمەڵگەی پێشکەوتووی ئەورووپای ڕۆژئاوادا کە لەئاست نارەزایەتی تیۆری و پراتیکیدا نەرم و نیانترە، لە گەشەی چـۆنی ژیـانی کۆمەڵایەتیـدا مەحکوم بە چەقینە؟ ئایا ئەورووپای ڕۆژهەڵات هەر بەوجۆرەی کـە مـارکس سەدەیەك پێش گوتوویە، دەبێتە "هێلانەی کۆنەپەرستی ئەورووپایی"؟

# تیۆری و پراتیك بە پێی نیازە مرۆڤییەكان

## ئاگنش هلێر

تیـۆری و پراتیـك، هەمیشـە توخمـە گەوهەرییـەكانی پێكهاتەیـەكی ئـابووری– كۆمەلایـەتی دیـاریكراون. هـەر بەمهۆیـە تیـۆری و پراتیكـی كۆمەلگاً جۆراوجۆرەكان نە تەنیا لە نێوەرۆكدا، بەڵكوو لە پێوەندییەكان و لەو دەورەی كە تیۆری لە كۆمەڵگە جیاوازەكاندا دەیگێڕێ، لێك جیـاوازن. هەروەها لە زۆرێك لە كۆمەڵگەكاندا... تیـۆری و پراتیـك لـە یـەكتر جیـاواز نین بەڵكوو ئەركی دووبارە بەرهەمهێنانەوەی كۆمەلایەتی پێكـەوە ئـەنجام ئەدەن. هەر بەمهۆیە بۆ وێنە ناتوانین لە روانگـەی ئـەم بابەتـەوە خـاڵێكی هاوبەش لـە نێـوان سـەرەتای چـاخی ناوەڕاسـت و كۆمەڵگـەی بورژواییـدا بدۆزینــەوە، چـونكە لـە چـاخی یەكەمـدا مەسـیحیەت نـە تـەنیا رۆڵـی ئایدیۆلۆژییـەكی یەكدەسـتی دەگێـرا، بـەڵكوو لەسـەر پراتیكـی رۆژانـەی خـەڵكیش كاریگـەر بـوو، بـەمجۆرە ئـەم دەرفەتـە بـۆ مـرۆڤ دەرەخسـا تـا كارەكـانی خـۆی بـە ئایـدۆلۆژی زاڵ راڤـەبكات. پرسـی گشـتی پێوەنـدی تیۆری و پراتیك، بەر لە گەشەی كۆمەڵگـەی بـورژوایی تەنانـەت گەلاڵـەش ناكرێـت، مەگـەر كاتـێ كـە مرۆڤـەكان ناچـار بـن نەچەسـپانی پرەنسـیپی تایبەتی خۆیان راڤەبكەن. بەلام ئەم كارە لەگەڵ پرسەكەی ئێمە پێوەندی نیە ئەوپەڕەكەی یەكێ لە رەهەندە لاوەكییەكانی ئەو پیشان ئەدات.

بـەمجۆرە پرسـی گشـتی تیـۆری و پراتیـك لـە پرسـە تایبەتـەكانی كۆمەڵگەی بورژوایی و بەرهەمی پێكهاتـەی ئـەم كۆمەڵگایـە و پیشـاندەری ئەم پێكهاتەیە.

کەوابوو ئەگەر بمانەوێ ئەم پرسە بە وردی و لە گشتێتی خۆیدا گەڵاڵە بکەین، دەبێ بەرۆشنی بزانین کە لێرەدا پرسێکی تایبەت لەئارا دایە و خودی گەڵاڵەکردنی پرسەکەش مۆرك و نیشانەی مێژوویەکی تایبەتی پێوەیە و رەنگە تەنیا بە قۆناغێکی مێژوویی تایبەتەوە... بەستراوە.

سەرەتا دەبێ بلێین کە هەرچەند گەشەی زانستی سروشتی – لە گالیلە بەملاوە– بەشێکی جیانەکراوەی ئەم پرۆسەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنیا پێوەندی نێوان تیۆری و پراتیك لە زانستی ئینسانیدا راڤە دەکەین.

گەڵاڵەکردنی پرسی پێوەندی نێوان تیۆری و کرداری کۆمەڵایەتی، جۆرێك بەرئەنجام – و فۆرمی بەیانی – دابەشبوونی کار و بەرهەمهێنانی بورژواییە. لە پاش دابەشبونی کار دایە کە توێژی روناکبیر، وەك توێژێکی کۆمەڵایەتی تایبەت کە ئەرکی "بەرهەمهێنانی" تیۆرییە، شکڵ دەگرێت. هەر لەم کاتەدا هێزە کۆمەڵایەتییەکان لێك جیادەبنەوە. لەلایەکەوە چەند هیزێك هەن کە تیۆری بەرهەم دێنن و لەلایەکیترەوە چەند هێزێکیتر هەن کە تیۆری پراکتیزە دەکەن. ئەم کارە تەنانەت لەو بابەتەشدا کە خولقێنەری تیۆری، نوێنەری راستەوخۆی بەرژەوەندی چینێکی کۆمەڵایەتی تایبەتیش بێت، راستە. لە کۆمەڵگەی بورژواییدا، لە راستیدا، جۆراوجۆرترین روانگەی تیۆریك زۆر جار لە مۆدێلی بەرهەمهێنانی کاڵاکان پێڕەوی دەکەن. ئەم روانگانە، چ ئینتمای چینێکی کۆمەڵایەتی تایبەت بەیان بکەن یان نا، لەهەر حاڵدا تێکەڵاوی بازاڕ دەبن. ئەڵبەت زۆر رۆشنە کە هەموو تیۆرییەکان دەستیان بە بازاڕ ناگا و لێرەدا پێویست ناکات باسیان بکەین، چونکە لەم بابەتەوە – و بەپێی پێکهاتەی کۆمەڵگای بورژوایی – ئەوان ناتوانن ببن بە پراتیك و سەرئەنجام بۆ باسەکەی ئێمە گرنگ نین. یەکەم شێواز کە تیۆری لە قاڵبی ئەودا دێتە بازاڕ، کتێبە. تیۆری بەمجۆرە بڵاودەکرێتەوە و دەتوانێ بۆ بەکارهێنان ئاراستە بکرێت.

شێوازە لاوەکییەکانی ئەو بانگەشە و راگەیاندنە، چ لە رێگەی هەندێ کەسەوە بگوێزرێنەوە یان لە رێگەی میدیا گشتییەکانەوە، یان لە هەر دوو رێگاوە.

لە سیستمی بازاڕی ئازاددا، تیۆریش دەبێتە کالآیەکی ئازاد. مرۆڤەکان بەپێی نیازەکانیان دەیکڕن یان نایکڕن، پراکتیزەی دەکەن یان نایکەن. ئەڵبەت لە دۆخی بازاڕی کونترۆڵ کراودا، پێشبڕکێی تیۆرییەکانیش بەرتەسکە. زۆربەی ئەو بەرهەمە تیۆرییانە کە برەویان هەیە، چەن کلێشەیەکن کە ئامانجیان رێنوێنی کردنی بیروڕای گشتی بە ئاراستەیەکی تایبەت دایە. سەرەڕای ئەمەش، لە کۆمەڵگەی بورژواییدا، تیۆرییەکانی لایەنی بەرهەڵستکار و تەنانەت تیۆرییە شۆڕشگێڕانەکانیش دەبێ ئەم رێگا سەوداگەرانەیە بپێون، چونکە ئەم کارە بەرئەنجامی پێویستی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیە. وتەی بەناوبانگی مارکس کە دەڵێ: "تیۆرییەك کە بچێتە نێو جەماوەر، دەبێتە هێزێکی مادی، لەلایەکەوە پێویستی بە جەماوەری ژێردەستی ئایدیۆلۆژی چینی دەسەڵاتدار هەیە و لەلایەکیترەوە، پێویستی بە تیۆرییەکی شۆڕشگێڕانەی بێجەماوەر هەیە. کەوابوو تیۆریسیەن ــ چ ئابوریزان و چ کۆمەڵناس یان بیرمەند ــ کەسێکە کە بەپێی یاسا تازەکانی دابەشبوونی کار، تیۆری خۆی ئاراستە بازار دەکات. چونکە ئێمە بە مۆدێلێکی تایبەت کار دەکەین، لە فرەچەشنی بزوێنەرەکان چاوپۆشی دەکەین و وایدادەنێین کە هەموو ئەو "مرۆڤانەی کە تیۆری بەرهەم دێنن" بەوهۆیە لە بازاڕدا بە کالآی تیۆری خۆیانەوە دەردەکەون، چونکە پێیان وایە ناوەرۆکی تیۆرییەکەیان دروستە و بە فرۆشتنی ئەم کالآیە تەنیا خوازیاری پوول یان بەرزبوونەوەی پێگەی کۆمەڵایەتی خۆیان نین، بەڵکوو هیواداران کە بڵاوبوونەوە یان

قەبووڵکردنی ئەندێشەی ئەوان بتوانێ لەسەر کۆمەڵگە بەگشتی، یان لە هەندێ بواردا، کاریگەر بێت. بێگومان وەها کارێك زۆرجار بە سەرکەوتن ناگات، بەڵام ئێمەش دەبێ لەم تۆژینەوەی خۆماندا لەمەڕ پێوەندی تیۆری و پراتیك، ئەم مەبەستانە لابەین. ئێستا پرسیاری ئێمە ئەمەیە: کێ ئەم کاڵایە دەکڕێ، بۆچی و بە چ مەبەستێك ئەم کارە دەکات؟ دەزانین کە بەگشتی توانەوەی[146] هەندێ ئەندێشە، تەنانەت ئەگەر بەجۆرێك جەماوەری بێتەوە، بەناچار بە مانای ئەوە نیە کە تیۆری ــ بە وەها دەرفەتێك ــ ڕێگای خۆی بەرەو پراتیك دیوەتەوە. زۆر جار ئەو کەسانەی کە تیۆرییەکان فێردەبن، تەنیا چەند بەکارهێنەرێکی پەتین کە تیۆری ڕاست وەك هەویری دان بەکاردەبەن. ئەم جۆرە "بەکارهێنانە" کە بە"فەرهەنگی گشتی" ناسراوە بە هەمان ڕادەی "مەرجی حەتمی"[147] پێوەندی بە هەندێ توێژی تایبەتی کۆمەڵگاوە هەیە، کە هەویری دان. ئەڵبەت خودی ئاستی بەکارهێنانیش ڕەنگە پیشاندەری هەندێ شت بێت: دەتوانێ پیشان بدات کام تیۆری لە کام توێژی کۆمەڵایەتی تایبەتدا خەریکە دەبێتە پراتیك، چونکە لەم حاڵەتەدا، ڕادەی داخوازی بەکارهێنەران زیاد دەکات. سەرەڕای ئەمەش بە هەر ڕادە زیاتر بازار کونترۆڵ کرابێت، ئەم نیشانەیە شاراوەترە.

لەبەر ئەوە کە ئێمە تیۆری لە ڕوانگەی پراتیکەوە شرۆڤە دەکەین، دەبێ هەموو ئەو "کڕیارانە کە بە مانای سەرەوە "بەکارهێنەر"ن لابەرین.

---

[146] Assimilation.
[147] Sine qan non.

کەوابوو تۆژینەوەکەمان بۆ ئەوانە تەرخان بکەین کە کاڵای تیۆریك بۆ پراکتیزەکردن دەکرێن، [کەوابوو] تۆژینەوەکەمان لە مەبەستەکانی ئەواندا و لەو ئامێرانەدا کە بەکاری دەبەن کورت دەکەینەوە.

بەڵام ئەم تۆژینەوە پێویستی بەوەیە کە سەرەتا مەبەستی ئێمە لە کردار (پراتیك) پێناسە بکرێت، یانی رۆشنی بکەینەوە کە کارکردی پراتیکی تیۆری چۆن پێناسە دەکەین. دەکرێ پراتیك بەمانای هەرە بەرینی وشە لەبەرچاو بگرین و ئەو بە هەڵگری هەموو تێکۆشانیکی کۆمەڵایەتی و سەرئەنجام هەموو تێکۆشانێکی مرۆڤایەتی بزانین. ئەمە بۆچوونێکی گرنگە، بەڵام ئەگەر پراتیك لە پێوەندی لەگەڵ تیۆریدا لێکبدەینەوە، بەکار نایەت. چونکە ئەگەر مانای بەرینی ئەو لەبەرچاو بگرین، هەموو تێکۆشانێکی تیۆریکش دەبنە چالاکی پراتیکی و ئەوجار دەرکی "جیاوازی تایبەتی" ئەوان ئیمکانی نیە. هەربەمهۆیە، بەبێ نکۆڵیکردن لە چەمکی پراتیك لە ئانتۆلۆژی گشتیدا، دەبێ چەمکێکی سنووردارتر بدۆزینەوە. بەڵام لێرەدا لەگەڵ دژوارییەکیتر بەرەوڕوو دەبین. بەتایبەت دژواری بێتوانایی بۆ ئاراستەکردنی پێناسەیەکی گشتی بۆ وەها چەمکێ لە پراتیك، چونکە هەر پراتیکێ کە بە مانای سنووردار لەبەرچاو بگیردرێ ناتوانێ لە دەرەوەی پێوەندی خۆی لەگەڵ تیۆری هاوتەرازی خۆی، مانایەکی هەبێت.

هەروەها لە درێژەی وتارەکەدا لەو ئایدیۆلۆژییانە کە جۆرێك پاساودانی سادەی کۆمەڵگای بورژوایین و هەروەها لە پراتیکێکی هاوتەراز کە یارمەتی بە پاراستنی ئەم کۆمەڵگایە دەکات، خۆدەبوێرین. وەها

ئایدیۆلۆژییەك تەنانەت ئەگەر بە تیۆریش حساب بکرێت، لە روانگەی ئێمەدا، بە تیۆری حساب ناکرێت. ئەوانە بەیانی راستەوخۆی جۆری وشیاری درۆینەن و تەنانەت رەنگە لەگەڵ تیۆری هاوشێوە بن، راست هەر بەوجۆرەی پراتیکی هاوتەرازی ئەوان شێوەپراتیکە و بەس.

پراتیکی جۆراوجۆر ـ و تیۆری خوازیاری ئەو ـ بەپێی ئامانجەکەی و هەروەها بەمپێیە کە لە تێکۆشانی جەماوەردا دەچەسپن یان نا، یان بەرەو کردارێکی جەماوەری دەچن، یان نا، بەپێی ئەو تێکۆشانە جەماوەرییە کە ئەم پراتیکانە لەودا دەچەسپن، یان بەرەو ئەو دەچن، لە یەکتر جیا دەکرێنەوە. پرسی درۆینەی "ئامێرەکان" زیاتر لەهەر شتی، پرسی بەکاربردن یان رەتکردنەوەی توندوتیژی ــ بە رای من لێرەدا گرنگی بنەرەتی هەیە هەروەها من پێم وایە کە جێگیرکردنی پرسی درۆینەی "ئامێرەکان" لە پلەی یەکەمدا لەئاست دەرکی جیاوازی هەقیقی نێوان تیۆری و پراتیکە جۆراوجۆرەکاندا دەبێتە لەمپەر. ئەم پرسیارە کە ئایا بەکاربردنی توندوتیژی دروستە یان نادروست، شیاوە یان ناشیاوە، پێویستە یان ناپێویست، بەرای من لەم ئاستەدا پرسیارێکی قسرە، لەراستیدا ئەم پرسیارە چارەسەر ناکرێت مەگەر لە بەستێنی پرسی کۆنکرێتدا، لە روانگەی ئامانجەکان و گەوهەری بزاڤیك کە لە کردارێکی تایبەتەوە هەڵقوڵیوە و هەروەها لە پێوەندی لەگەڵ دۆخێکی تایبەتدا. هەر تیۆری و هەر پراتیکێ لەهەر دۆخێکی تایبەتدا، چەندین ئامێری هەیە کە لەگەڵ ئەوان تەواو سازگارە. ناتوانین لەمەڕ بەکارهێنان یان رەتکردنەوەی توندوتیژی بڕیار بدەین، مەگەر لە رێگەی زنجیرە

تۆژینەوەیەکی بەرینەوە بۆ دیاریکردنی سازگاری ئەو ــ نە سازگاری توندوتیژی بەگشتی، بەڵکوو سازگاری یەکێ لە مودێلەکانی ئەو لەگەڵ ئامانجی کردارێکی تایبەت، یان لەگەڵ بزاڤی کۆمەڵایەتی هاوتەرازی ئەو، دەبێ ناسازگاری ئەویش دیاری بکەین و لەم بابەتەوە، ناسازگاری، ئامانجەکان و خۆدی بزاڤ تێکدەشکێنێ یان ئەوان بەرەو ئاراستەیەکی جیاواز لەگەڵ مەبەستی سەرەتا لادەدات.

لێرەدا دووپاتی دەکەینەوە کە بۆ پۆلینبەندی واقعی مۆدێلە جیاوازەکانی پراتیك، ئامانجەکان و ناوەرۆکی بزاڤە کۆمەڵایەتیەکانی، کردارێکی تایبەت دەکەینە بنەما. لەم روانگەوە چوار کرداری خوارەوە لێك جیادەکەینەوە.

ئەلف) تێکۆشانێك کە ئامانجی ئەو گۆڕینی هەندێ لە بەشەکان، دام و دەزگاکان یان مناسباتی کۆمەڵگایە و دەکرێ بە "رێفۆرمی پاژی" ناودێری بکەین. لەم بابەتە تایبەتەدا، چاکسازی پاژی مەبەستە و کەوابوو لە قەوارەی ئەو کۆمەڵگایە سەرتر ناچێ. وادەنوێنێ کە زۆربەی ئەم تیۆری و چالاکیە ریفۆرمیستییانە لە چەندین بواری ئابووری، سیاسی، فێرکاری یان یاساییدا چەق دەبەستن. چاکسازی پاژی زیاتر لەلایەن کارناسان (پسپۆڕانی دەڤەرێکی تایبەت)ـەوە گەڵاڵە دەکرێ، بەڵام ئەوان تەنیا خۆیان لەم کارەدا بەشداری ناکەن. ئەم ریفۆرمە بەگشتی بە سەرەتایەك لە "بزاڤی رەخنەگرانە"لە دژی دام و دەزگا داڕزیوەکان حساب دەکرێت. پێگەی جەماوەری ئەم کارە، لەمەڕ رێفۆرمێکی بەرتەسك، رەنگە بەتەواوی سنووردار بێ و تەنیا بە تێکۆشانی کارناسان کورت بێتەوە، بەڵام زۆرجار وا شتێك روونادات. بەهەر رادە بەرئەنگاری لەئاست چاکسازی پاژی بەهێزتر بێت، جەماوەری بەشدار بەرفراوانترن —

لەلایەکەوە بەهۆی ئەو زەخت و فشارە کە دەیخولقێنن و لەلایەکیترەوە لە چەسپاندنی ئەم ریفۆرمەدا... لەم بابەتەوە کردەوەی جەماوەر کاتییە و هەر کە چاکسازی بە ئەنجام بگات، دادەمرکێ و نامێنێ. ئەم بزاڤانە (تەنانەت بەپێچەوانەی مەبەستی رێبەرانی) رەنگە بەئاسانی وەك ئامێری زەخت و گوشار بەکار ببرێن، چونکە نارەزایی لە سیستمێکی کۆمەڵایەتی تایبەت بەرەو گۆرانی بەرهەست (و هەندێجار پاژی) دام و دەزگاکان رێنوێنی دەکەن و لەم رێگەوە ئەگەری گۆرینی سیستمی کۆمەڵایەتی ناوبراو بەرواڵەت چەسپێندراو پیشان ئەدەن.

ب) دووهەمین جۆری پراتیك، دەیەوێ تێکرای کۆمەڵگا لە رێگەی ئاڵوگۆری پاژییەوە بگۆرێ. ئێمە ئەم کارە بە "رێفۆرمی گشتی" ناودێر دەکەین. دەکرێ تیۆریداڕێژانی بزاڤی رێفۆرمی گشتی بەوجۆرە پێناسە بکەین کە لەئاست تێکرای سیستمی کۆمەڵایەتی زاڵ هەڵوێستی رەخنەگرانەیان هەیە. ئەوان کارناس نین، یان ئەگەر هەشبن، خۆیان بە کارناسان پیشان نادەن. زۆربەی ئەوان رێبەری بزاڤەکانن یان لە پێوەندی لەگەڵ بزاڤەکانی هەموو کۆمەڵگەدا پێناسە دەکرێن. بزاڤەکانی چاکسازی گشتی جەماوەرێکی بەرین رێك دەخەن و بەجۆرێك رێکخراون کە بزاڤ پاش ئەنجامدانی هەندێ رێفۆرمی پاژی ئارام ناگرێت، بەڵکوو بەردەوام "ئەکتیڤ" دەمێنێتەوە. وەك بزاڤەکانی سۆسیال دێموکراسی بەر لە 1914.

ج) سێهەمین جۆری پراتیك لە بزاڤی شۆرشگێرانەی سیاسیدا دەچەسپێ. ئامانجی ئەو گۆرینی بنەرەتی تێکرای کۆمەڵگایە کە لە درێژەی ئەودا، گەیشتن بە دەسەلاتی سیاسی، ساتێکی گرنگ و چارەنوسسازە. ئەم بە دەسەڵات گەیشتنە رەنگە بە دوا ئامانج حساب بکرێت، هەرچەند لە زۆربەی ئایدیۆلۆژییە شۆرشگێرە سیاسیەکاندا، تەنیا دەوری خاڵی دەسپێك دەگێرێ. پێگەی جەماوەری ئەم بزاڤانە رەنگە کەم

تـا زۆر بـەرفراوان بێـت. ئەگـەر ئـەم پێگەیـە بەرتەسـك بێـت، ئەگـەری سـەرکەوتن ئێجگـار کـەم دەبێتـەوە. بەپێچـەوانەوە، لـە بزاڤـی سیاسـی شۆڕشگێڕانەی سەرکەوتوودا، پێگـەی جـەماوەری خەسـڵەتێکی دوالیتـەی هەیە. هێزی ڕێبەری بزاڤەکە زیاتر کەمینەیەکە (ئلیتانی شۆڕشگێڕ) کە لـە ئـەنجامی هـەر کارێکـدا، لێبڕاوانـە هـەموو مەترسـیەکان قـەبوڵ دەکـات. ئەڵبەت بە پشتیوانی و بە داکۆکی جەماوەر. بەڵام هەر کە بە سـەرکەوتنی سیاسـی گەیشـت، لـەناکاو بزاڤـی پاشەکشـە دەسـت پێـدەکات. چـالاکی جـەماوەر لاواز دەبـێ و تووشـی وەسـتان و پاسـیڤیزم دەبێـت. هـەموو شۆڕشە سیاسییەکان کە لەنێو کۆمەڵگەی بورژوازیدا ڕوودەدەن هـەر ئـەم ڕەوتـە دەپێـون (شۆڕشـە سیاسـییەکان تـەنیا لـە چوارچـێوەی وەهـا کۆمەڵگەیەکـدا بـەرپا دەبـن). باشـترین و ڕەسـەنترینی ئـەم شۆڕشـە سیاسییانە ژاکوبنیزمی فەرانسیە.

بۆ دەرکی باشتری ئەم بزاڤە دەبێ وتـە بەناوبانگەکـەی مـارکس وەبـیر بێنینەوە، ئەو دەڵـێ: لـە [بـیری] کەسـێکدا کـە لـە کۆمـەڵگای بورژواییـدا بەسـەر دەبـات، بـورژوا لـە شـارۆمەند، جیادەبێتـەوە. ژیـانی ئاسـایی، "سروشـتی" مرۆڤـی کۆمەڵگـەی بـورژوایی، ژیـانی تـاکی بورژوایـە، ژیـانی مرۆڤێکی ئیزولەیە کە بۆ بەرژەوەندی خێـرای خـۆی، خـەبات دەکـات. زۆر ڕۆشنە کـە ئەمـە ژیـانێکی لەخۆنامۆیـە، چـونکە بـورژوا – بەتایبـەت– لـە چـالاکی کۆمەڵگـە دەسـت هەڵـدەگرێ. ژیـانی شـارۆمەندانەی ئـەویش لەخۆنامۆیە، چـونکە تێکۆشـانی ئـەو لـە بـواری سیاسـیدا، ئـەو لـە ژیـانی ڕۆژانە – زیاتر لە هەر شـتێ لـە ژیـانی ڕۆژانـەی خـەڵکیتر و، هـەروەها لـە ژیانی شارۆمەندی تایبەتی خۆی – جیادەکاتەوە. ئەم دابڕانە نە لە ئینتما بـۆ شۆڕشـی سیاسـی لـەنێو دەچـێ و نـە لـە پراتیکـی بەرهـەمی ئـەم ئینتمایـەدا. شـێوەی ژیـان، ڕەوتـی ژیـانی مرۆڤـەکان هـەر وەك پێشـوو دەمێنێتەوە. کـەوابوو جیگـەی سەرسـوڕمان نییـە کـە کـاتی گەیشـتن بـە دەسـەڵات پێگـەی جـەماوەری بەرتەسـك بێتـەوە و تەنانـەت لـەنێو بچـێ.

زۆرینــەی خــەڵك دەچــنەوە باوەشــی ژیــانی بــورژوایی. بــەڵام کەمینــە، لــە ئلیناســیۆنی ژیــانی شــارۆمەندیدا، یەخســیر دەبــن. بــە وتــەی ئــنگڵس: دەســــەڵاتی بــورژوازی جێگــەی دەســــەڵاتی ئــەقڵ دەگرێتــەوە (ئــانتی دورینگ).[148]

د) چــوارەمین جــۆری پراتیــك، پراتیکــی شۆڕشــگێڕانەی کۆمەڵایــەتی بەرفراوانە. ئەم جۆرە پراتیکە لە هەمان حاڵدا شـۆڕش لـە شـێوە ژیـانیش دایە. هەرکات کە شۆڕشی شێوە ژیان لە کـاردا بێـت، پێگـەی جـەماوەری بزاڤەکان بەردەوام بەرینتر دەبێتەوە. ئـەم شۆڕشـە، بەشـێوەی دەشـندە چـین و توێـژی بـەرفراوانتر لەبـەر دەگرێـت کـە شـێوەی ژیانیـان بـە هـۆی

[148] "... بیرمەندانی سەدەی هەژدەهەم، ئەم پێکهێنەرانەی شۆڕش، ئەقڵیان بە تاقە داوەری هەموو شتەکان دەزانی. دەبوو دەوڵەتێکی ئەقڵانی و کۆمەڵگەیەکی ئەقڵانی پێکبێت، ئەو شتەی کە لەگەڵ ئەقڵی هەمیشەیی دژواز بووبا، دەبوو بێ ڕەحمانە نابووت بکرێت... ئەڵبەت ئەم ئەقڵە هەمیشەییە بێجگە لە ئەقڵی رازێندراوی چینی ناوەڕاست کە بەرەو بورژوازی دەگۆڕا، شتێکیتر نەبوو. بەڵام کاتێ شۆڕشی فەرانسا ئەم کۆمەڵگا ئەقڵانی و دەوڵەتە ئەقڵانییەی پراکتیزە کرد، ئەو دام و دەزگا تازەیە، هەر چەندەش لە بەراورد لەگەڵ دۆخی پێشوو ئەقڵانی بوون، بەڵام ئاشکرا بوو کە هەرگیز بەشێوەی رەها ئەقڵانی نین، دەوڵەتی ئەقڵانی بەتەواوی هەڵشکابوو، پەیمانی کۆمەڵایەتی رۆسۆ لە حکومەتی ترۆردا پراکتیزەکرا... کۆمەڵگەی ئەقڵانیش چارەنووسێکی باشتری پەیدا نەکرد. لەجیاتی ئەوەی کە ناکۆکی نێوان دەوڵەمەند و هەژار بە گەشەی سامان و ئاسایشی گشتی چارەسەر بکرێت، زیاتر بووبوو.... گەندەڵی جێگەی سەرکوتی زەختاوی گرتەوە، لەجیاتی شمشێر وەك بەرزترین ئامێری دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی، پوول جێگیر بوو. لەشفرۆشی بە رادەیەکی زۆر پەرەی سەند. ژیانی هاوبەش کە وەك رابردوو، شکڵی یاسایی قەبوڵ کراوو وەك سەرپۆشی رەسمی لەشفرۆشی مابۆوە، لەگەڵ زنای روو لە زیاد بوون گەشەی کرد. بەکورتی، ئەو دام و دەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتییە کە "سەرکەوتنی ئەقڵ" پێکی هێنا، لە بەراورد لەگەڵ قەوڵ و بەڵێنی فریوکارانەی بیرمەندانی سەردەمی رۆشنگەری وەك کاریکاتۆرێکی خەمهێنەر دەرکەوتن..."

بەشداری لەم بزاڤەدا، تووشی گۆڕان دەبێت. هەر بەمهۆیە، شۆڕشەکانی شێوە ژیان، لە داهاتویەکی مێژوویی نزیکدا، ڕووئەدەن و پاشگەزبوونەوەیان بۆ نییە. لە مێژووی ئەوروپادا، مەسیحیەت و، لە هەندێ ولاتدا، چاخی ڕنێسانس نمونەی ئەم جۆرە شۆڕشانەیە لە شێوە ژیاندا.

بەلام ئەگەر ئێمە گوتومانە شۆڕشی کۆمەلایەتی بەرفراوان، هەمیشە شۆڕش لە شێوەی ژیانیش دایە، مەبەستمان ئەوە نەبووە کە شۆڕشەکانی شێوە ژیان، هەمیشە شۆڕشی کۆمەلایەتی بەرفراوانن. بەپێچەوانەوە دەتوانین بە دلنیاییەوە بلێین کە مێژوو تا ئەم سەردەمە هێشتا شۆڕشێکی لە شێوە ژیاندا بەخۆوە نەدیوە کە شۆڕشێکی کۆمەلایەتی بەرفراوان، وشیارانە و هەلگری هەموو بوارەکانی کۆمەلگا، هەر لە ژیانی ئابووری تا بواری سیاسەت و فەرهەنگ بووبێت.

مارکس سەرەڕای ئەمەش، بزاڤی کۆمۆنیستی لە قالبی وەها کردارێکی شۆڕشگێڕانەی بەرفراواندا پێشان داوە. ئەلبەت ئەو پشتی بە بەراوردکردنی مێژوویی نەبەستووە. بۆوەی کە بزاڤی کرێکاری لە ناخی کۆمەلگەی بورژواییدا گەشە دەکات، بەناچار قۆناغی شۆڕشی سیاسی لە پێش دایە– چونکە دەبێ دەسەلاتی سیاسی بەدەس بێنێ. بەلام لە ڕوانگەی مارکسدا شۆڕشی سیاسی تەنیا قۆناغێکە و بەس، چونکە ئەو ڕزگاری مرۆڤ لەئاست ڕزگاری سیاسی پەتیدا دادەنێت. ئێمە ناتوانین لێرەدا ئەم پرسە بەدرێژی شرۆڤە بکەین، تەنیا ئەم بنەمایە گەلالە دەکەین کە شۆڕشی کۆمەلایەتی بەرفراوانی مەبەستی مارکس، لە هەمان قۆناغی سەرەتاییدا، پێویستی بە هەلچوون لە پێکهاتەی بورژوایی تیۆری و پراتیك هەیە. بەپێچەوانەوە، هەر سێ پراتیك کە لە سەرەوە راڤەکران – چ ڕیفۆرمی پاژی، یان ڕیفۆرمی گشتی، یان شۆڕشی سیاسی– سێ جۆر تیۆری و پراتیکی [ریفۆرمیستی] و شۆرشگێڕانەن کە لەگەل پێکهاتەی بەرهەمهێنانی بورژوایی سازگارن.

ئێستا با بزانین کە کڕین، چەسپاندن یان تێکۆشان بۆ چەسپاندنی "کالا تیۆرییەکان" — لە سێ بابەتی یەکەمدا— بەرەو کوێ دەڕوا و چ ئامانج و مەبەستێکیان هەیە.

گەشەی داخوازی بۆ "کالای تیۆری" پیشاندەری هەبوونی نیازێکە[149] ئەگەر بەکارهێنانی رووتی فەرهەنگی لابەرین، ئەوجار تێدەگەین کە ئەم تیۆرییە کۆمەلایەتییە جۆرێک پێویستی دەرک یان بەیان کردووە— پێویستییەك کە بەناچار تیۆریك نیە.

بۆ ئەوەی کە بتوانین توێژینەوەکەمان بەم ئاراستەیەدا سەربخەین، بەکورتی مانای "نیازی کۆمەلایەتی" شرۆڤە دەکەین. ئەلبەت هەرچەند کە لە بەرهەمەکانی ئێمەدا چەمکی نیاز زۆر بەکاردەبرێت، بەلام پێناسەکردنی ئەو ئێجگار دژوارە و هەروا ئالۆز و تەماوی ماوەتەوە.

نیاز، ویستی وشیارانە، ئینتما، ئارەزوویەکە کە بەردەوام بەرەو بابەتێك مەیلی هەیە و بەمهۆیە تێکۆشانێك دەبزوێنێ. ئەم بابەتە بەرهەمێکی کۆمەلایەتییە. ئەمە کە وەها بابەتێك کالای مەسرەفی بێت، یان جۆرێك شێوەی ژیان، یان تەنانەت "مرۆڤێکی تر"، بە هەر حال لە نێوان بەرهەمستبوونەوەی[150] کۆمەلایەتی و نیازە کۆمەلایەتییەکاندا پێوەندییەك گەلالە دەبێت. بەرهەمستبوونەوە کۆمەلایەتییەکان، پێویستییەکانی کەسانێکی زیندوو لە کۆمەلگەیەکی تایبەت و لەنێو توێژێکی کۆمەلایەتی تایبەتدا "گەلالە" و دیاری دەکەن. کەوابوو نیاز، تاکیە (تەنیا تاکەکان وشیارانە مەیل و ئارەزوویان بۆ شتێك هەیە) لە هەمان حالدا کۆمەلایەتیە (هەر نیازێك بەشێوەی بەرهەمستبوونەوەی کۆمەلایەتی دەردەکەوێت). "نیازی سروشتی" بوونی نییە. بەمجۆرە بۆ وێنە هەوا بۆ ئێمە نیاز نییە بەلکوو هۆکارێکی ژیانبەخشە. بەلام خواستنی

[149] Besoin.
[150] Objectivation.

هەوای خاوێن لەجیاتی هەوای پیس نیازێکە. سەرەڕای ئەمەش دەبێ لەنێوان "نیاز حەیاتییەکان" و "نیازە ئینسانییەکان"دا جیاوازی دابنێن.

"نیازە حەیاتییەکان" یان نیاز بۆ "مانەوە" چەند پێویستییەکی ئانتۆلۆژیکن، چونکە بە وزەبەخشین بە ژیان، بەردەوامی پێدەبەخشن. ئەم جۆرە نیازانە بریتین لە: نیاز بە خواردن، نیازی سێکسی، نیاز بە تێکۆشان، نیاز بە پێوەندی و هاوکاری کۆمەڵایەتی. بەڵام ناشکرێ ئەم نیازانە لە ریزی نیازە "سروشتی"یەکاندا لەقەڵەم بدەین، چونکە ئەوان وەك نیاز، ئێجگار بەرفراوان و هەمەلایەنەن و تەنیا لە بوارێکی کۆمەڵایەتی تایبەتدا مانایان هەیە. هەر بەمهۆیە، بۆ نموونە، تەنانەت بۆ نیازەکانی خواردنیش ناکرێ "رێژەیەکی سروشتی" دیاری بکەین. وەك دەزانین لە هەندێ هۆزی ئافریقادا بەکاربردنی کالۆری ئێجگار کەمتر لەو رێژەیە بوو کە ئێمە بە پێویستی دەزانین، بەڵام ئەو کەسانە، لە بەراورد لەگەڵ قۆناغی گەشەی تایبەتی خۆیاندا، تووشی کەم خۆراکی نەبوون. کەم خۆراکی تەنیا وەك بەرئەنجامی لێکترازانی هاوکێشی کۆمەڵایەتی دەرکەوتووە. دەتوانین بیسەلمێنین کە بەگشتی، پێکهاتەی کۆمەڵگەی سەرەتایی، بەگشتی نیازەکانی مانەوەی دابین و مسۆگەر کردووە. رێژەی ئەم دابینکردنە بەهۆی سروشتەوە دیاری کراوە: لەو شوێنەدا مردنی بەکۆمەڵ، بەهۆی رووداوە سروشتیەکانەوە رووی داوە. بورژوازی یەکەم کۆمەڵگەیە کە بە هۆی سروشتی پێکهاتەی خۆیەوە چینە کۆمەڵایەتییەکان بەتەواوی ناچار بە خەباتی رۆژانە دەکات تا نیازەکانی مانەوەیان دابین بکەن. ئەم دۆخە لە سەردەمی پاشەکەوتی سەرەتایی سەرمایە تا سەدەی بیستەم لە ئەورووپا زاڵ بووە و ئیستاکەش لە جیهانی سێهەمدا زاڵ بووە. مارکس بەم مەبەستە گوتویە چینی کرێکاری سەردەمی ئەو وەك چینێکی "بێنیاز"ی لێهاتووە، یان تەنانەت نیازەکانی حەیاتی تا ئاستی شێوەحەیوانی دابەزیون.

"نیازی ئینسانی" راستین، لەئاست "نیازە حەیاتییەکان" بەرەو چەن ئامانجێك دەئاژوون کە بزوێنەرە سروشتییەکان، لەواندا دەوری راستەوخۆ نابینن. لەوانە حەسانەوە کە بۆ بەرهەمهێنانەوەی هێزی کار پێویستە، چالاکی فەرهەنگی، بیرکردنەوە، عیشق، دۆستی، ئینتما بۆ پشکووتنی هەمەلایەنە، نیاز بە ئەخلاق. هەروەها نیازە ئینسانییە لەخۆنامۆکانیش وەك پارە، دەسەلات، داگیرکردنیش نیازی لەم جۆرەن. لە کاتی پەرەگرتنی بورژواییەوە — هەر لەوکاتەوە کە خەباتی چینی کرێکار تەنیا بە خەبات بۆ دابینکردنی نیازە حەیاتییەکانی تەرخان بووە — نیازە ئینسانییەکان، نیازی لەخۆنامۆن. لە کۆمەڵگەی بورژوایی مۆدێرندا (لانیکەم لە ئەورووپا و ئەمریکا) تاقە گۆڕان لەم پرسەدا شاراوەیە کە زاڵبوونی نیازە مرۆڤیە لەخۆنامۆکان، لەسەر چەندین چین و توێژی کۆمەڵایەتی بەرفراوان و هەروەها چینی کرێکار پەرەدەگرێت.

ئەو نیازە مرۆڤییانە کە لەخۆنامۆ نین، نیازی چۆنین. گەشەی ئەوان — لە بواری فاکتی ئوبژکتیڤدا — بە پاشەکەوتی بێسنووری ئەوان دیاری ناکرێت، بەڵکوو بە گەشە و بەرینبوونەوەی ئەوان — ئەو شتەی کە مارکس بە "سامانداری" ناودێری کردووە — دیاری دەکرێ. لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم کە جیاوازی نێوان نیازە حەیاتییەکان و نیازە مرۆڤییە رەسەنەکان رێژەییە. رەنگە نیازە مرۆڤییە رەسەنەکان هەندێ جار هەندێ لە نیازە حەیاتییەکان بەرەو خۆ رابکێشن. وەك نیازی ژن و پیاو بە یەکتر. بەپێچەوانەوە، نیازە ئینسانییە لەخۆنامۆکان، نیازی رێژەیین. یانی لە پراتیکدا هەرچەندە زیادبکرێن و لەسەر یەك کەڵەکە بن بەدەگمەن بە "ئاستی رەزامەندی" دەگەن. تەنیا هۆکارێك دەتوانێ لەئاست کەڵەکەبوونی لەرادەبەدەری نیازە رێژەییەکان — نیزە لەخۆنامۆکان —دا رابوەستێ: سەرهەڵدان و سەربوونی نیازە چۆنییەکانە. لەم بابەتەوە بۆچوونی مارکس لە کۆمۆنیزم زیاتر ئەم پرسە رۆشن دەکاتەوە: ئەو کۆمۆنیزمی بە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی زانیوە کە لە درێژەی ئەودا، نیازە

حەیاتی و لەخۆنامۆکان (نیازی ڕێژەیی) زیاتر لە پێشوو دەچنە ژێر دەسەڵاتی نیازە ئینسانییە ڕەسەنەکان (نیازی چۆنی).

پاش ئەم باسە پێویستە، دەگەڕێینەوە بۆ بابەتی مۆدێلە جیاوازەکانی تیۆری و پراتیك. گوتمان کە کارکردی پراتیکی تیۆری لەوە دایە کە تیۆری دەتوانێ نیازەکانی سەردەم "ڕۆشن بکاتەوە". بەڵام بۆ دەبێ ئەم نیازانە "ڕۆشن بکەینەوە"؟

نیازە ئینسانییەکانی کۆمەڵگەیەکی تایبەت لە بەرھەستبوونەوەی زەقی هەموو چاخ و سەردەمەکاندا، دەردەکەون هەر ئەم بەرھەستبوونەوەیە کە سنوورەکانی بزاڤ و نوێبوونەوەی نیازەکان دیاری دەکات. لە دوا پلەدا، ئەم پرسە لەمەڕ کۆمەڵگەی بورژواییش ڕاستە، بەڵام پێویستی دولایەنەی نیازەکان و بەرھەستبوونەوەکان لەم کۆمەڵگەیەدا لە کۆمەڵگە نا"پەتی" یەکانی پێشوو ئێجگار ئاڵۆزترە. ئێمە پێشتر ئاماژەمان بە یەکێ لەم ئاڵۆزییانە کردووە: تەنیا کەڵەکەبوونی نیازە چەندییەکان هەر لە سەرەتای کۆمەڵگەی بورژواییەوە ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێ. بەڵام ئەم کارە تەنیا یەکێ لە بەرئەنجامەکانی هێزێکی بزوێنەری گەورەترە: سەرمایەداری لە جەوهەری خۆیدا، یەکەم کۆمەڵگەی ئەکتیڤە کە لەودا، بەدوای خێرایی سەرسوڕهێنەری بەرھەمهێناندا نە تەنیا ڕێژەی کاڵا مەسرەفییەکان زیاد دەبێت، بەڵکوو هەروەها — بەشێوەیەکی خێراتر لە پێشوو —چەندین شت و مەکی تازە و نیازی تازە دەخولقێنێ. هەروەها بورژوازی ، یەکەم کۆمەڵگەی "کراوە"یە کە لەودا نیازەکان، تایبەت بە چەن چین و توێژێکی کۆمەڵایەتی لە پێشدا دیاریکراو نیە. ئەگەر بابەتی نیازێك لە بەرھەستبوونەوەی کۆمەڵایەتیدا دەرکەوێت، بەخێرایی دەتوانێ —لانیکەم لەرووی تیۆرییەوە— وەك نیازێکی گشتی دەرکەوێت، سەرەڕای ئەوەی کە دەرەتانی دابینکردنی ئەویان هەیە یان نا. ئەم پرسە نە تەنیا نیازە چەندییەکان، بەڵکوو لەمەڕ هەموو نیازەکان ڕاستە. کەوابوو ئەوە

تەنیا پێکهاتەیەکی یەکدەست لە نیازەکان نیە کە لە ناخی سیستمە بەرهەستبوونەوەکان (و هەروەها بەها) یەکدەستەکاندا "جێگیر" کراوە، بەڵکوو لەنێوان ئەو نیازانەدا کە بەشێوەی ناهەموار بەرهەست دەبنەوە دەرفەتی بژاردنی –لانیکەم تیۆریك هەیە. کەوابوو، دابینکردنی چەن ئاستێکی بەرفراوان لەو نیازە تاکییانەی کە لەگەڵ یەکتر جیاوازن ئیمکانی هەیە. هەروەها بورژوازی یەکەم کۆمەڵگایە کە لەسەر چەندین کۆمۆنی ئورگانیك[151] رانەوەستاوە، تاقە کۆمۆن، لێرەدا، بازاڕە. بەمجۆرە، لە کاتێکا لە کۆمەڵگەکانی پێشوودا، ئاستی بەهای پەیوەست بە نیازەکان کە لە ناخی کۆمۆنەکاندا شکڵیان دەگرت تاکیش ناچار بوو ئەو نۆرم و نەریتە قەبوڵ بکات کە کۆمۆن بەسەر ئەودا دەیسەپاند، پاش پەیدابوونی کۆمەڵگەی بورژوایی، ئیتر ئەم کارە ئیمکانی نەبوو: لە بەستێنی نیازەکانیشدا مناسباتی فرەنێوەنجی[152] لەجیاتی مناسباتی کۆمەڵایەتی راستەوخۆ جێگیر بوون.

ئەندامی کۆمۆن پێویستی بەوە نەبوو کە بۆ "رۆشنکردنەوەی" ئەم نیازانە تێبکۆشێ. ئەو نیازەکانی تاکەکانی کۆمەڵگەی خۆی بەسادەیی دەناسی، ئەو پێویستییانەی کە ئەو– بەپێی توانای تیۆریکی خۆی – لە هەر ئاستێکدا، بەشێوەیەکی کەم تا زۆر قووڵ و گونجاو بەیانی دەکرد. بەڵام ئەو کاتەش کە پێویستییەکانی کۆمەڵگەیەکی دیکەی بەیان دەکرد، ئەم کارەی بەپێی ئەو پێویستییانە کە کۆمۆنێکی دیکە پێشتر دیاری کردبوو، ئەنجام ئەدا. ئەم خاڵە ئەوەندە کە لەمەڕ توماس ئاکویناس راستە ئەوەندەش لەمەڕ ئەفلاتوون راستە. لە بەرانبەردا، لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا کە تێیدا کۆمۆنی ئورگانیك نیە و تیۆریسیەن – وەك کرێکاری فکری– زیاتر لە پێشوو دەبێتە پێڕەوی وەها سیستمێکی

---

[151] Cmmunautes organiques.
[152] Multi- Mediatisee.

دابەشبوونی کار، کە لەودا بەیانی راستەوخۆی پێویستییەکان کە لەگەڵ بەرهەستبوونەوەی بەستێنی سازگار بێت گەشە دەکا، ئیمکانی نیە. هەر بەمهۆیە تیۆریسیەن دەبێ لە دیدگای تایبەتی خۆیەوە دەس پێ بکا، و بەشێوەی تاکی کۆمەڵگەی خۆی شرۆڤە بکاو تیۆری خۆی دابرێژی، تەنیا لەپاش ئەنجامی ئەم کارەیە کە — لە بازاڕدا— روون دەبێتەوە کە ئایا لە روونکردنەوەی نیازەکاندا سەرکەوتوو بووە یان نا، و سەرئەنجام ئایا لە بەیانی ئەو نیازانەدا بە ئاکام گەیشتووە یان نا. کەوابوو کاتێ کە بەرهەستبوونەوەی ناهەموار، نیازەکان دیاری بکات، پانتایی بژاردنی تیۆرسیەنیش — لانیکەم بەشێوەی تیۆریك — بەرین دەبێتەوە. بژاردنی وشیارانەی بەهاکان... دەتوانێ لە چارەنووسی تایبەتی تیۆریدا رۆڵی بنەڕەتی بگێڕێ: ئایا دەیکرن یان نا، پراکتیزەی دەکەن یان نا، کام چین و توێژ پراکتیزەی دەکەن؟ دەرکی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی — بەتایبەت ئەگەر ئەم پێکهاتە قووڵ و ئاڵۆز بێت— رەنگە بەم دژوازی[153] یە بگات کە هیچ توێژێکی کۆمەڵایەتی، بەیانی نیازەکانی خۆی لە تیۆریدا ناناسێتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو تیۆرییە لەگەڵ بەرژەوەندی ئەو سازگار بێت. لەوانە چارەنووسی لویاتانی هابز[154] وابوو. هەر وەها رەنگە ئەم کارە بە دۆخێکی بە هەمان رادە دژواز بگات کە لەودا چەن توخمێکی تیۆری پراکتیزە دەکرێن، جەماوەری دەبنەوە (لەگەڵ چەن نیازێکی گرنگ و حەیاتی سازگارن) بە بێ ئەوەی کە هەموو ئەو سیستەمە تیۆریکە بچەسپێندرێت. (وەك چارەنووسی مارکسیزم، لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەم بەملاوە). سەرئەنجام — پاش گەشەکردنی بورژوازی، تەنیا نیازە رێژەییەکان، نیازە حەیاتییەکان رۆڵی دیاریکەر دەگێڕن— ئەو

[153] Paradoxe.

[154] Hobbes، بیرمەندی ئینگلیزی (1588–1679). لە کتێبی لویاتان دا تیۆری فەلسەفی و سیاسی خۆی شرۆڤەدەکات کە بەپێی ماتریالیزمی مکانیکی پێکهاتووە.

تیۆرییانەی کە بەخێرایی پراکتیزە دەکرێن، ئەوانەن کە ئەم نیازانە بەیان دەکەن، یان چەن توخمێك لەوانە کە ئەم نیازانە دەردەخەن.

ئێستا دەبێ پێوەندی چوار رەوتی پراتیکی باسکراو لەگەڵ دنیای نیازەکان و لەگەڵ ئەو تیۆریانەی کە ئەم پێویستییانە بەیان دەکەن بەکورتی راڤە بکەین.

تیۆرییەکانی چاکسازی پاژی و بزاڤە کۆمەڵایەتییەکانی سازگار لەگەڵ ئەو، هەر لەسەر بنەمای نیازە کۆنەکان بەیان و فۆرمولە کراون دەیانەوێ هەر ئەم نیازانە دابین و رێبەری بکەن و لەگەڵیان زیاترین سازگارییان هەیە. ئەم تیۆرییانە زیاتر وەك سوپاپ رۆڵ دەبینن کە لەئاست شۆڕش و ئاخێزەکاندا دەکرێنەوە و لە کەڵەکەبوونی قین و نەفرەت و بێزاری پێشگیری دەکەن. ئەم تیۆرییانە و ئەم جۆرە بزاڤانە، بەردەوام نیازە چەندییەکان و "نیازەکانی مانەوە" بەیان دەکەن. بەمجۆرە، لەبەر ئەوە کە ئەم تیۆرییە، بەشێوەی ئیزولە دەمێنێتەوە، بەشێوەی ئۆرگانیك کۆمەڵگەی باسکراو پاساو دەدا و لەودا دەتوێتەوە و سەرئەنجام بەکردەوە وەردەگیرێ و هەمان کۆمەڵگا سەرلەنوێ بەرهەم دێنێتەوە. پێوەندی نێوان تیۆری و پراتیك لە مکانیزمی بەرهەمهێنانی کاڵاکان پێرەوی دەکات. لە بابەتێکدا کە تیۆری رێفۆرمی پاژی خواستێك دابین دەکات، [خواستێکی نزمە و] دەرفەت و دەرەتانی سیاسی و مادی دابین کردنی ئەوی هەیە.

تیۆرییەکانی چاکسازی گشتیش هەر نیازەکانی پێشوو ئاراستە دەکەن، بەڵام ئەم کارە وشیارانە ئەنجام ئەدەن. بزاڤەکان و راگەیاندنی ئەوان ... لە هەمان حاڵدا کە ئەم نیازانە بەگشتی گەڵاڵە دەکەن، چەندین نیاز بۆ جەماوەر "فەراهەم دەکەن" کە تا ئێستا لای ئەوان نەبوون، ئەوان لە بوون و نەبوونی ئەوانە ئاگادار نەبوون. هەر ئەم بەرهەستبوونەوەیە —

تا ئەو شوێنە کە بەرەو گۆڕینی هەموو کۆمەڵگە دەئاژوون — دەتوانن وەك پردێك بەرەو نیازە تازەکان دەور ببینن. سەرەڕای ئەمەش ئەم نیازانە، پێکهاتەیەکی یەکدەست و ئۆرگانیك دروست ناکەن. کاریگەری و بڕشتی تیۆری لە بواری ڕێکخستندا بەتایبەت لەو شێوازەدا ئاشکرا دەبێ کە تیۆری، ناکۆکی نێوان وجودی پەتی چینێك لەگەڵ نیازەکانی ئەو... بەیان دەکات. ئەو نیازە دابین نەکراوانە کە تیۆری باسیان دەکات، لە پلەی یەکەمدا، نیازی حەیاتین و تەنیا لە پلەی دووهەمدا نیازی چەندین، و تەنیا هەندێ جار نیازی چۆنین. لێرەدا پێوەندی تیۆری و پراتیك بەتەواوی لەگەڵ مۆدێلی بەرهەمهێنانی کالایی سازگارە(گرووپی کارناسان لەم بزاڤانەدا هیچ رۆڵێك ناگێڕن). گەشە و پەرەگرتنی داخوازی کەم تا زۆری تیۆری دیاری دەکا و لە پراتیکدا ناچاری دەکات بەر لە هەر شتێ بەرەو نیازە حەیاتی و ڕێژەییەکان بچێت: لەم حاڵەدا مناسباتی بورژوایی نێوان تیۆری و پراتیك چارەسەر نابن. کەوابوو ئەم جۆرە بزاڤانە جۆرێك نزیکی لەگەڵ یەکەم پلەی تیۆری و پراتیك ئاراستە دەکەن. ئەو بزاڤانەی کە بۆ چەسپاندنی ڕیفۆرمی پاژی ئینتمایان هەیە، چەمکی سەرەتایی ڕیفۆرمی گشتی ئالۆز دەکەن. هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، بزاڤەکانی سۆسیال دیموکراتی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم ڕێك وەها ڕەوتێکیان پێواوە.

ڕەوتی سێهەم تیۆری و بزاڤی سیاسی شۆڕشگێرانە— ئەوکاتەی کە لەسەر جیایی پێکهاتووی نێوان بورژوا و شارۆمەندی کۆمەڵگەی بورژوایی پێکدێت — لەمەڕ پرسی دارشتنی نیازەکان، دەس دەداتە مەزەندەیەکی دوالیتە. ئەوان تێناکۆشن تا جەماوەر لە دنیای نیازە "تایبەت"ـەکانی کۆمەڵگەی بورژوایی جیابکەنەوە، ڕێکخستنی جەماوەر هەروا لەسەر بنەمای پێکهاتەی نیازەکانی کۆمەڵگەی بورژوایی دەچێتەپێش. سەرەڕای

ئەمەش، گرنگی زۆر بە هەڵخڕاندنی هەست و سۆز[155] ئەدەن. بەڵام ئەم هەست و سۆزە ڕێکخراوانەش، ناتوانن (لانیکەم لە ئاستی جەماوەردا) لەو هەستانەی کە لە ناخی کۆمەڵگەی بورژوازیدا بارهاتوون، جیاواز بن. ڕێك هەر ئەم رووهێنانە بۆ نیاز و هەست و سۆزەکانی کۆمەڵگەی بورژوایی، یەکێ لە هۆکارە گرنگەکانی پرۆسەیەکی نموونەییە کە پێشتر ئاماژەی پێکرا: دامرکانی بزاڤی جەماوەری لە قۆناغی پاش گەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسی. ئێمە هەروەها دەزانین کە ڕێبەری بزاڤی شۆڕشگێڕانەی سیاسی، شارۆمەندێکی ئلیتە. تاکی ئلیت ناتوانێ دەور و کارکردی سیاسی هەبێت مەگەر ئەوە کە – بە ویستی خۆی و لانیکەم بەشێوەی کاتی– لە هەندێ لە نیازەکانی خۆی دەس هەڵگرێت. ئەم چاوپۆشی – ڕیازەتکێشییە شۆڕشگێڕانە– یە دەتوانێ مایەی دڵگەرمی چەندین کرداری قارەمانانە بێت، کە سپاس و ستایشی خەڵك هەڵخرێنێت. کەوابوو، بەرهەستبوونەوەی پراتیکی شۆڕشگێڕانەی سیاسی، پێویستی گۆڕینی پێکهاتەی نیازەکان دێنێتەئاراوە. بەڵام سەرەڕای ئەمەش، ئەم کارە گەلێ کێشەی لاوازی هەیە. لە پلەی یەکەمدا ئەم سیستمە دووپارچەیەی نیازەکان، ناکۆکی نێوان بورژوا و شارۆمەند لەنێو نابات بەڵکوو بەپێچەوانەوە، بەهێزی دەکات. هەروەها، ئەم سیستمەی نیازەکان کە لە ناخی کۆمەڵگەی بورژواییدا هەڵقوڵیوە و پێکهاتووە، تەنانەت لای شارۆمەندیش برەوی هەیە و تەنیا دابینبوونی نیازەکانی ئەمڕۆ فەراهەم نەبووە و بۆ داهاتوو دانراوە. سەرئەنجام ئەم سیستمە دوالیتەی نیازەکان بەشێوەیەکی ئێجگار کاریگەر لەسەر یەکێ لە نیازە گرنگەکانی کۆمەڵگەی بورژوازی رادەوەستێ: نیازی دەسەڵات. هەر بەمبۆنەوەیە کە ڕیازەتکێشی تاکی ئلیت نە هەر ناتوانێ لەئاست ئلیناسیۆن زاڵ بێت،

[155] Passions.

بەڵکوو لەوەش خراپتر – و بەپێچەوانەی هەموو قارامانگەری خۆی– بەردەوامی پێدەبەخشێ.

هەموو ئەم خاڵانە پیشان ئەدەن کە بزاڤی شۆڕشگێڕانەی سیاسیش پێکهاتەی مناسباتی تیۆری – پراتیکی کۆمەڵگەی بورژوایی بەشێوەی بنەڕەتی ناگۆڕێت. جارێکی تر تیۆری لەسەر نیازەکانی پێشوو دادەڕێژرێ و لەو ئاستەشدا کە بۆ دروستکردنی نیازە تازەکان – نیازی چۆنی – تێدەکۆشێ، ئەم هەوڵەش رێك وەك هەوڵەکانی بزاڤی چاکسازی گشتی جێگەی بڕوا نیە و بە پێکهاتەیەکی تۆکمە لە بەهاکان ناگات. لە ئاکامدا تەنانەت لەم رەوتەشدا تیۆری دەبێ لەگەڵ نیازەکانی کۆمەڵگەی بورژوایی خۆی رێك بخات – هەم بزاڤی جەماوەری و هەم تاکی ئلیتیش – تەنانەت ئەگەر بەشێوەیەکی جیاوازیش بێت دەبێ خۆ رێك بخەن. چارەنووسی ئایدیۆلۆژی ژاکوبنی، یەکێ لە هۆکارە ئاشکرا و ناسراوەکانی ئەم رەتەیە. هەر بەمهۆیە، بزاڤی شۆڕشگێڕانەی سیاسی، لە ژیانی رۆژانەدا و لە سیستمی نیازەکانی جەماوەردا گۆڕانێکی قوول و بنەڕەتی ناخولقێنێ.

کەوابوو، بزاڤی شۆڕشگێڕانەی بەرفراوان نە دەتوانێ بەو شێوەیە کە لە سەرەوە باسکرا، دەرکەوێ و نە "سەرکەوێ". بۆیە وشەی "سەرکەوێ"م لەنێو گیومە داناوە چوونکە سەرکەوتنی بزاڤی شۆڕشگێڕانە کە هەموو کۆمەڵگا بگرێتەوە، لە کاتێکی تایبەتدا ڕوونادات. ئەم سەرکەوتنە هەرگیز تاقە کارێك یان کۆمەڵە کردارێك نییە بەڵکوو هەمیشە جۆرێك پرۆسەیە. ئەویش وەها پرۆسەیەك کە خودی مرۆڤەکان – جەماوەری بەرفراوان– دەیبەنە پێش. لە بزاڤی شۆڕشگێڕانەی بەرفراواندا تێکڕای کۆمەڵگا خودی مرۆڤەکانن – کە لە درێژەی گەشەی بەردەوامی ئوبژکتیڤ بوونی خۆیاندا– پێکهاتەی نیازەکان و بەهاکانیان دەگۆڕن. تیۆری لێرەدا لەگەڵ

نیازەکانی جەماوەری ئێستا یان ئەو جەماوەرەی کە لە حاڵی گرسـان دان "هاوتەراز" نـابێ و لەسـەر نـاکۆکی نێـوان وجـود و نیازەکـانی مـرۆڤ پێـك نایەت، بەڵکوو لە ناخی خـودی بزاڤـی رێکخـراوی جـەماوەردا گەشـەدەکا. شـۆڕش لـە ڕوانگـەی مارکسـدا، هـەروەك گوتمـان، شۆڕشـێکی بـەرین و کۆنکرێتە کە تێکڕای کۆمەڵگا دەگرێتەوە و مناسباتی کۆمەڵگەی بورژوایی نێوان تیۆری و پراتیك، و هەروەها، تێکڕای پێکهاتەی بـورژوایی نیازەکـان دەسڕێتەوە.

بەڵام ئاڵۆزی چەسپاندنی تیۆری مارکسیستی هەر لێرەدا شاراوەیە. لـە کۆمەڵگەیەکدا دەبێ شۆڕشـی بـەرین و کۆنکرێـت بکرێـت کـە پێکهاتەکـەی لەسەر بەرهەمهێنانی کاڵاکان و دابەشبوونی کـار راوەسـتاوە، سـەرئەنجام دەبێ لەناخی ئەو سیستمەدا، پێوەنـدی تیـۆری و پراتیـك، وەك پرسـێکی گشـتی گەڵاڵـە کرابـێ و لـە رێگـەی بـازاڕەوە، وەك کردارێکـی گشـتی چەسپێندرابێت. دەبێ تێکڕای نیازەکان و بەهاکان لە کۆمەڵگەیەکدا نـوێ بکەینەوە کە لەخۆنامۆیی تا قـووڵایی ئـەو رەگـی کوتـاوە– هەرچـەند کـە چـینی کرێکـار لـەم ئلیناسـیۆنەدا "هەسـت بـە بێـزاری دەکـا"[156] — لـە کۆمەڵگەیەکدا کە نیازەکانی جەماوەر زیاتر لـە هـەر شـتێ نیـازی حـەیاتی

---

[156] لە"ماڵباتی پیرۆز"دا هاتووە: "چینی بورژوا و چینی کرێکار، هەر دوو، ئلیناسیۆنێکی ئینسانی تاقانە پیشان ئەدەن، بەڵام چینی یەکەم لەم ئلیناسیۆنەدا "هەست بە ئاسایش دەکات"و لەودا توانایی تایبەتی خۆی دەناسێتەوە و بە رواڵـەتی ژیان ئینسانی دەگات. بـەڵام دووهـەم چین لـەم ئلیناسـیۆنەدا هەسـت بە نـابووتی دەکـات، بێتوانـایی خـۆی و راستیەکانی ژیانی دژە ئینسانی لەودا دەبینێتەوە. بە وتەی هێگل، ئەو لە حاڵەتی ئاخێر لـە دژی ئـەم دۆخـە پـر لـە زەبـوونی و سـووکایەتیە دایـە، ئاخێزێـك کـە نـاکۆکی نێـوان خەسڵەتی ئینسانی ئەوو بارودۆخی ژیانی ئەو کە بەشێوەی ئاشکراو لیبڕاوانە لە دژی ئەو خەسڵەتەیە، بەرەو شۆڕش دەیبات..."

یان نیازی ڕێژەیین. بێگومان بۆ ئەنجامدانی ئـەم کـارە، شۆڕشـی سیاسـی پێویستە، بەڵام بە تەنیایی نـاتوانێ پێکهاتەیـەکی تـەواو نـوێ بخـولقێنێ. مـارکس چــەندین جـار تێکۆشــاوە تــا بەتایبــەت بــە چــەمکی "نیــازە بنەڕەتییەکان"، وڵامێك بۆ ئەم پرسیارە ئاڵۆزە، بنووسـێتەوە. نیازەکـانی چینی کرێکار "نیازی رادیکاڵ"ن، چونکە هەر ئەم چینەیە کە ئیمکانی نیە نیازەکـانی لــە قــاڵبی کۆمەڵگــەی بورژواییــدا دابــین بکرێـت. دابینبــوونی نیازەکانی ئەو بەناچاری لە کۆمەڵگەی بـورژوایی و سـەرئەنجام لـە هـەموو پێکهاتەی ئەو سـەرتر دەچـێ. چـینی کرێکـار نـاتوانێ خـۆی رزگـار بکـات مەگەر ئەوە کە هەموو مرۆڤایەتی رزگار بکات و چەندین بزاڤی کۆمەڵایەتی بۆ سڕینەوەی خاوەندارێتی تایبەتی و ئلیناسیۆن بەرپا بکات. بەڵام کێشە کاتێ سەرهەڵئەدات کە لەگەڵ ئەم راستییە بەرەوڕوو دەبین کە لە راستیدا بەناو "نیازە رادیکاڵەکان" بەو مانایە کە تا ئێستا بـەکارمان بـردووە نـین. لـە راسـتیدا نیـازی رادیکـاڵ نیازەکـانی ئـەمڕۆ و درێـژەی ئەمانـەش نـین، چونکە پێویستیان بە چینی کرێکارێکی وشیارە کە ئەرکی مێـژوویی خـۆی ناسیوە، وەها چینێك کە — بە وتەی لوکاچ— "وشیاری شیاوی"[157] خـۆی خولقاندووە و بەپێی ئەو کار دەکات. بەمپێیـە ئێمـە دەتـوانین لـە ڕێگـەی قیاسـەوە،"نیـازی رادیکـاڵ" بـە "نیـازی شـیاو" نـاودێر بکـەین. بـەڵام ئەزموونی مێژوویی — تا ئێستا — پیشانیداوە کە بـەبێ سـڕینەوەی شـێوە ژیانی بورژوایی و پێکهاتـەی بـورژوایی وەهـا"وشـیاریەکی شـیاو" ناتوانـێ لـەنێو جـەماوەردا پـەرەبگرێت، لەئاکامـدا "نیـازی رادیکـاڵ"یـش دروسـت نابێت. قەبووڵکردنی وشیارانە یان ناوشیارانەی ئەم راسـتیە، دەرسـەکانی مارکس خەوشدارناکات، چونکە رەوتە جۆراوجۆرەکانی بزاڤی کرێکاری بـە رووهێنان بۆ نیازەکانی کۆمەڵگەی بورژوایی لە پلەی یەکەمدا بەرەو نیـازە حەیاتی و ڕێژەییەکان ڕۆشتوون.

---

[157] Conscience adequate.

بەڵام ئەگەر بەرنامەی مارکس لەمەڕ شۆڕشی کۆمەڵایەتی بەرفراوان بە جدی وەرگرین، ئەوجار – هەروەها بە سەرنجدان بە ئەزموونە مێژووییەکان – دەبێ بۆ ڕێگای تر بگەڕین. ئەم ڕێگا نوێیە، شۆڕشە لە هەموو شێوە ژیاندا و خولقانی چەندین پێکهاتەی تازەی نیازەکانە کە لە هەموو بوارێکی تێکۆشانی مرۆڤەکاندا، هەر لە ژیانی ڕۆژانەوە تا ئاڵۆزترین چالاکییەکان دەگرێتەوە. خولقاندنی پێکهاتەیەکی تازە لە نیازەکان تەنیا کاری ئەو مرۆڤە ڕێکخراوانەیە کە لە کۆمۆنێکی ئۆرگانێك دان. بەڵام ئەگەر ئەو نیازە رادیکاڵە کە دروس دەبێت، لە راستیدا نیاز نەبێت، ئایا ڕێخستنی وەها گرووپێکی ئۆرگانیك دەتوانێ لەسەر هەر بنەمایەك پێکبێت؟ ئایا وەها بەرنامەیەك خەیاڵی نییە؟

بەڕای من توخمەکانی وەها بەرنامەیەك هەر ئێستا پێکهاتووە و دەکرێ ئەوانە لە ئاکار و ڕەفتاری چەندین توێژی روو لە گەشەدا بەدیبکەین. زۆر جەماوەری بەرین و بێئەژمار هەست بە نارەزایەتی دەکەن، لە دنیای نیازە ڕێژەییەکان، "بێزارن" و بەشێوەی ناوشیار بۆ شێوەیەك لە ژیان دەگەڕن کە لەودا، ئیتر نیازە ڕێژەییەکان زاڵ نەبن. کاتێ کە لە پێشکەوتووترین کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا، توێژێك لە لاوان (بەتایبەت باشترینیان) لە سیستمی بەها نەریتییەکانی بنەماڵە (فریزێر، ئۆتۆمبیل، و پرستیژی کۆمەڵایەتی) روو وەردەگێڕن. کاتێ کە لاوان – دیسان باشترینیان – پۆل پۆل زانکۆکان بەجێ دێڵن، کاتێ کە شێوازێکی تازە لە بنەماڵە – کۆمۆنی ئۆرگانێك – لە هەموو جێگایەك پەرە دەستێنێ، هەموو ئەمانە پیشان ئەدەن کە پێویستی گۆڕینی پێکهاتەی نیازەکان لەدایك بووە. ئەم نیازە چۆنییانە کە لەئاست نیازە چەندییەکان جێگیردەبن، هەر چییەك بن، پیشاندەری ئەم راستییەن کە بزاڤی کۆمۆنی ئۆرگانێکی پێکهێنەرەی نیازی رادیکاڵ، خەیاڵ نییە، یوتۆپیا نیە.

وەها شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بەرفراوان – کاتێ کە بەئەنجام بگات– سروشتیە کە لە بزاڤی ڕیفۆرمی پاژی و ڕیفۆرمی گشتی و شۆڕشی سیاسی نکۆڵی ناکات، بەپێچەوانەوە، هەر سیانیان وەك چەند قۆناغێك دەپارێزێ بەم جیاوازیەوە کە ئەم بزاڤانە بە ئامێر دەزانێ نە ئامانج. ئیتر لە ئەستۆی بزاڤی سۆسیالیستی دایە کە تێکۆشی چەندین کۆمۆنی بەرین و ئۆرگانێك پێکبێنێ کە لەواندا نیازە چۆنییەکان زاڵ بێت. تەنیا وەها بزاڤێك دەتوانێ دوالیتەی بەرهەمی کۆمەڵگەی بورژوایی نێوان فێرکار و فێرخواز، پێشەنگ و جەماوەر، شارۆمەند و بورژوا، تیۆری و پراتیك، بسڕێتەوە.

پێوەندی نێوان تیۆری و پراتیك، لە وەها شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بەرفراواندا، چۆن پێکهاتەیەکی دەبێ؟ تیۆری و پراتیك بە پشتبەستن بە کۆمۆنی ئۆرگانێك – کە جیاوازی لەگەڵ کۆمەڵگای پێشوودا لە هەڵبژاردنی ئازاد دایە و ئەمەش خاڵێکی گرنگە– ئیتر لە "بازاڕ"دا دەرناکەوێ. خودی ئەم کۆمۆنە ئۆرگانێکە – پێداویستییەکان و نیازەکان – تیۆرییەك کە ئەم پێداویستی و نیازانە بەشێوەی کەم تا زۆر شیاو، قووڵ و تۆکمە بەیان دەکات، بەرهەم دێنێ و بە کاری بەردەوام – کە چالاکی تیۆریك، بەشێکی جیانەکراوەی ئەو دەبێ– ئەم تیۆرییانە دەنرخێنێ و گەشەی پێدەدات. تیۆری، بەرهەمی ئۆرگانێکی پراتیکی ڕۆژانە دەبێت، ئەڵبەت ئەمە بەو مانایە نییە کە تیۆری خۆی ناتوانێ پراتیکی بەرهەمی خۆی بنرخێنێ و گەشەی پێبدات. بەڵکوو ئیتر ئەوە تەنیا تیۆری نیە کە لەسەر پراتیك "کاریگەری دەبێت" بەڵکوو پراتیکی کۆمۆنی ئورگانیکی تیۆرییەك کە ئەو بەیان دەکات، لەسەر تیۆری و پراتیکی کۆمۆنەکانی تریش کاریگەری دەبێت. بەمجۆرە پرسی گشتی تیۆری و پراتیك – کە هەر وەك دیمان پرسێکی تایبەتی کۆمەڵگەی بورژواییە– بێمانا دەبێت.

# کاتی ئازاد و دابەشبوونی کار

ماریا مارکوش و ئاندراش هێگدوش

لە بەرهەمەکانی مارکسدا دەتوانین سەرەداوی دوو بۆچوون لەمەڕ دەرفەتی بەرینکردنەوەی پانتایی سەربەخۆیی مرۆڤ بەدیدبکەین. هەرکام لەم دوو بۆچوونە، لە ئەندێشەی زانستی– کۆمەڵایەتی هاوچەرخدا لایەنگرانی تایبەتی خۆیان هەیە.

بەپێی یەکەم بۆچوون، گەیشتن بە هەرێمی ئازادی — بە سەرنجدان بەو ئاستەنگانەی کە دابەشبوونی کاری هەنووکە پێکیهێناوە — تەنیا لە دەرەوەی کاتی کاری کۆمەڵایەتی فەراهەم دەبێت. کەوابوو، بەرزترین ئامانجی گەشەی کۆمەڵایەتی، زیادکردنی کاتی ئاسایشە، ئەوەش بەجۆرێك کە خودی تاك بتوانێ بەشێوەی گەشندە لە سروەتی مادی و مەعنەوی کۆمەڵگە بەهرەمەند بێت و جیاوازی نێوان ئاستی گەشەی تاك و ئەو دەرفەتانەی کە کۆمەڵگە فەراهەمی دەکات، کەم بکاتەوە. بەپێی دوهەم بۆچوون، ئەرکی بنەڕەتی، ئینسانیکردنی دۆخی کارە. بەمبۆنەوە، دەبێ ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لە خودی دەڤەری کاری کۆمەڵایەتیدا بەئەنجام بگا و بەر لەهەر شتێ تەگەرەکانی بەرهەمی دابەشبوونی کار لەنێو ببرێن و پاشان شێواز و مکانیزمێك پەرەبگرێت کە لەگەڵ کونترۆڵی کۆمەڵایەتی بەراستی کاریگەر سازگار بن. کەوابوو دەبێ وەها دەرفەتێك بۆ هەر تاکێك برەخسێ تا هەموو کەسێتی خۆی لە دەڤەری کاردا بپشکوێنێ. یەکێ لەو بابەتانەی کە دەمانەوێ لەم توێژینەوەدا بیسەلمێنین ئەوەیە کە دنیای کار و دنیای ئاسایش، لەگەڵ یەکتر پێوەندی توندوتۆڵیان هەیە و سەرئەنجام

پێکهێنانی ئاڵوگۆڕی قووڵ لە دەڤەرێکیاندا لەهەمان حاڵدا دەڤەرەکەیتر دەگرێتەوە.

ئەزموونەکان پیشانیان داوە کە ئەگەر گەیشتن بە"هەرێمی ئازادی" لە کاتی ئاسایشدا بەرتەسك بێتەوە، رێگە چارەیەك پەیدا نابێ. کاتی ئازاد بەو چالاکییانە پڕ نابێتەوە کە دەتوانن کەسێتی تاك و تواناکانی ئەو بپشکوێنن، بەڵکوو بۆ بەدەسهێنانی پارە سەرف دەکرێت. بەمپێیە ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی کە لە کاتی ئازاددا ئەنجامدراوە، بە چەندین شێوەی جیاواز، وەك بەشێك لە رێخراوی بەرهەمهێنان دەردەکەون و لەراستیدا دەکەونەبەر کاریگەری خراپی دابەشبوونی کارەوە. ئەزموونەکان سەلماندوویانە کە زیادکردنی "کاتی ئازاد" لەخۆیدا شێوەی ژیانی مرۆڤەکان ناگۆڕێت، بەڵکوو لانی زۆر دەرفەتێ زیادکردنێ هەوڵەکان یان تێکۆشانی تازە فەراهەم دەکا کە هەندێ لە نیازە خێراکان دابین دەکەن. بەلاّم دووهەم بۆچوون (ئینسانیکردنی کار) یش، لەگەڵ چەندین کۆسپ و تەگەرە بەرەورِوو دەبێ. دابەشبوونی کار مرۆڤەکان بەگشتی لە چەن پیشەیەکی تایبەتدا بەدرێژایی هەموو تەمەنیان دەبەستێتەوە. بێجگە لەمەش زۆر جار، هەڵبژاردنی ئەم کار و پیشانە بەهۆی هۆکاری دەرەکیەوە دیاری دەکرێن و بە دڵخوازی کرێکارانی (ژن یان پیاو) دیاری ناکرێن، ئەم ئاستەنگانە بەتەواوی پێش بە گەشە و پشکووتنی تاك دەگرن.

بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەك لەم بنبەستە، دەبێ داوەکانی هەر دوو رەوتی ناوبراو لێکبدەینەوە.

ئەگەر بە زیادکردنی کاتی ئاسایش هیوادار بین، یەکێ لە روونترین هۆکارەکان ئەوەیە کە کاتی دەرەوەی کاری"رەسمی"لە هەموو ولاّتە پێشکەوتووەکاندا بەراستی زیاد دەکات. رەنگە ئەم پرسە بەو ئاکامەمان بگەیەنێ کە کاتی ئازادی واقعیش هەر بەو رادەیە زیاد دەکات. بەلاّم، بەکردەوە، لە هەموو ئەم ولاّتانەدا، کاتی بەدەر لە کاری "رەسمی"کە بۆ

بەدەسهێنانی پارە سەرف دەکرێ بە هەمان رادە زیاد دەکات.[158] ئێستا ئەم دیاردەیە بەتایبەت لەمەڕ پیاوان راستە، چونکە ژنان بەهۆی ئەرکی گرانی کاری نێو ماڵە، لەراستیدا بەکردەوە کاتی ئاسایشیان نیە. تەنانەت ئەگەر کەمبوونەوەی کاتی کاری رەسمی درێژەی ببێت، دیسان ناتوانین چاوەڕێی هیچ جۆرە ئاڵوگۆڕێکی واقعی لەم دۆخە دابین چونکە ئاشکرایە کە پرۆسەی ماشێنیکردن زۆرتر ئەرکەکانی نێوماڵە ئاسان دەکات، بەڵام کاتی ئاسایش زیاد ناکات (هەروەها، گەشەی گشتی نیازە فەرهەنگییەکان پێویستی بە کاتی گەشندەیە بۆ دابینکردنی ئەوان).[159] لە هەمان حاڵدا، ئەم کارانەی نێوماڵیش چەن تێکۆشانێکن کە بەهۆی جۆرێ زەختی ئابووری ئەنجام ئەدرێن و هەموو ئەو خاڵانەی کە لەمەڕ دابەشبوونی زۆرەملی کار گوترا لەمەڕ کاری نێوماڵەش راستە.

گرنگی ئەو بەشە لە کات کە لە دەرەوەی کار، "سەرفی بەدەستهێنانی پارە " دەکرێ، زۆر بە دژواری دیاری دەکرێت. زۆر چالاکی و تێکۆشانی جۆراوجۆر لەبەرچاو دەگیردرێن: کاری نیوە وەخت، زێدەکاری، کاری نێو باخچە و نێومەزرا، ئەرکی نێوماڵە و ... ئەڵبەت بەو هۆیە کە لە هەموو ئەم کارانەدا (کاری نارەسمی) ئازادی و سەربەخۆیی زیاترە و تاکەکان بۆ خۆیان کارەکان هەڵدەبژێرن، زیاتر وزە و تواناییەکانیان وەگەڕ دەخەن.

---

[158] لە کتێبکدا کە کۆمەڵناسی پۆلۆنی danecki تازەیی چاپی کردووە، ئەم خاڵە، بەیارمەتی فاکتەکانی وڵاتانی سۆسیالیستی و هەروەها سەرمایەداری، بە بەڵگەوە سەلمێندراوە. گەڵاڵەی تۆژینەوە fzweig لەمەڕ کرێکارانی ئینگلیزی ئەم بابەتەی بەدرێژی سەلماندووە.

[159] فوراستیە پێشبینی دەکات کە لە20 ساڵی داهاتوودا سەعاتی کاری زۆرەملی لە رۆژئاوادا بۆ 30 سەعات کەم دەکرێتەوە، بەڵام کاتی پێویست بۆ ئەنجامدانی کاری نێوماڵە، بەپێی ژمارەی منداڵانی بنەماڵە، لەنێوان 40 تا 80سەعاتدا دەبێت.

لە هەنگاریاشدا هاوكات لەگەڵ كەمبوونەوەی سەعاتی كاری رەسمی، رێژەی كاتی "ئاسایش" كە بۆ بەدەستهێنانی پارە سەرف دەكرێ، زیادی كردووە.[160]

سەرئەنجام، كاتێكی ئێجگار كورت دەمێنێتەوە كە بەپێی وتەیەكی ماركس: "دەبێ راستەوخۆ لە دەڤەری بەرهەمهێناندا سەرف نەكرێ، بەڵكوو بۆ ئاسایش و حەسانەوە تەرخان بكرێ و دەرفەتێك بۆ چالاكی ئازادانە و گەشەی [تاك] فەراهەم بكات" چالاكییەك "كە – بەپێچەوانەی كار– بەهۆی زەختی دەرەكی دیاری نەكراوە، بەڵكوو ئەنجامدانی ئەو پێویستییەكی سروشتی یان ئەركێكی كۆمەڵایەتییە".

ئێستا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە: چ هۆكارێك تاكەكان ناچار دەكا تا كاتی ئاسایشی خۆیان لەپێناو پارە سەرف بكەن؟ لە پلەی یەكەمدا دەبێ دابینكردنی ئامێر و كەرەسە مادییە پێویستەكان بۆ "ئاستی ژیانی شیاو" بە یەكێ لەم زەختانە بزانین. بە لەبەرچاوگرتنی ئاستی گەشەی ئێستای هەنگاریا، ئەم بابەتە، توێژێكی بەرینی كۆمەڵگە دەگرێتەوە. ئەڵبەت دەبێ ئەوەشمان لەبیر بێت كە پێوەری "ئاستی ژیانی شیاو" تووشی

[160] بەپێی راپرسییەكی كۆمەڵناسانەی ئێجگار تازە لەمەڕ شێوەی گوزەرانی كاتی ئاسایشی كرێكارانی سەنعەتی كە لە ناوەندە شارییەكاندا بەسەر دەبەن،17٪ كرێكارانی كارگەكانی پیشەسازی قورسی بوداپێست، 15٪ كرێكارانی ناوچەكانی دەوروبەر و 24٪ كرێكارانی هەرێمەكانی تر، پیشاندەری گەشەی سەعاتی زێدەكارین. 18٪ كرێكارانی پسپۆڕ و 26٪ كادێرە ئیدارییەكان كاری نیوە وەخت دەكەن، لەهەر دوو دەستەدا دوو لە سێی كرێكاران پیشەی دووهەمیان هەیە. جگە لەمەش دەبێ شێوەی گوزەرانی سەردەمانی حەسانەوەش لەبەرچاو بگرین.
بەشێكی بەرین لە كرێكاران لە رۆژانی پشوواندا بە موچەی خۆیانەوە كار دەكەن، یان شتێك كە زۆر باوە بە هیچ شێوەیەك لە ئیجازەی ساڵانە(یان تەنانەت بەشێك لەو) بەهرەمەند نابن.

ئاڵوگۆڕێکی گرنگ هاتووه. بەڵام ڕۆشنە کە هەندێ شت کە وەك بەشێك لە پێویستی سەرەتایی ژیان حساب دەکرێن (وەك خانوو و هەندێ کاڵای مەسرەفی فرەخایەن) بە داهاتی ئەمڕۆ دابین ناکرێن.

بەگشتی، داخوازی گەشندە بۆ ئەو شتانەی کە بەشێکی بەرین لە کرێکاران، بە سەرنجدان بە ڕێژەی ئێستای داهاتی نەتەوەیی، ناتوانن دابینی بکەن لە داخوازی بۆ دەرفەتی ئاسایش زیاتر بووە.[161]

گەشەی "ویستی خاوەندارێتی" لەژێر کاریگەری دیاردەی ڕوولەگەشەی مەسرەفی پرستیژهێنەر دایە...

بژاردە سەرەکییەکان بەپێی کار و ڕەگەز

| | کادێرەکان | | کرێکارانی پسپۆڕ | | کرێکارانی ناپسپۆڕ | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| بژاردەکانی هەڵبژاردن | ژن | پیاو | ژن | پیاو | ژن | پیاو |
| کەرەسە و ئامێرە مادییەکان لە کاتی ئاسایش بە باشتر دەزانن... | 18 | 21 | 30 | 28 | 37 | 24 |
| بەهای سامانی مادی و کاتی ئاسایش وەك یەکن. | 71 | 70 | 56 | 63 | 49 | 66 |
| کاتی ئاسایش لە سامانی مادی سەرترە. | 11 | 7 | 13 | 7 | 11 | 3 |

[161] تۆژینەوەی پێشووی Miklos Szanto زۆر فاکتی گرنگ دەردەخات کە پیشان ئەدەن توێژە جۆراوجۆرەکانی حەشیمەت، بەدەستهێنانی ئامێرە مادییەکان لە کاتی ئاسایش بە گرنگتر دەزانن.

لەنێوان ئەو لاوانەدا کە خێزان دروست دەکەن یان سەربەخۆ دەبنەوە، دابینکردنـی "ئاسـتی ژیـانی شـیاو" و مەسـرەفی پرسـتیژهێنەر، دوو بزوێنەری ئێجگار گرنگن. ئەم لاوانە لەگەڵ پێویستی پێکهێنانی بنەمایەکی مادی بۆ ژیانی سەربەخۆ (خانوو، کەرەسە پێویستەکان بۆ ژیـانی رۆژانـە، پێویستی نیازە تاکییەکانی تر – ژن یان منداڵ –) بـەرەوڕوون لـە هـەمان حاڵدا لەو کەسانەن کە نیازە جۆراوجۆرەکانیان بەخێرایی دەگۆڕدرێت...

رێك لەنێو ئەم گرووپە لە لاوان دایە کە داخـوازی بـۆ دووهـەم پیشـە و زێدەکاری بەدیدەکرێ لە هەمان حاڵدا زۆربەی ئەو کەسانەی کە بەشێوەی نۆبەتی یان بەردەوام و بە ویسـتی خۆیـان شـەوکاری دەکـەن، لـەنێو ئـەم کەسانەدان.

چەندین جۆری جیاوازی پێویستی مادی روو لەگەشە،و جیاوازی نێـوان ئاسـتی ئەوانــە و دەرفــەت و ئامێرەکـانی دابینکردنیـان تـەنیا ریشــەی بێبەشی نین، بەڵکوو بێگومـان کاریگـەری زیـادکردنی موچـەکانیش زیـاتر دەکـەن. لەراسـتیدا ئـەم پرسـە دەبـێ دەرفـەتی پێشخسـتنی گەشـەیەکی ئەکتیڤتر فەراهەم بکات. بەڵام ئەم دەرفەتە، لە بواری بەرهەمهێناندا، بـەم لەمپەرە بەرتەسك دەبێتەوە کە دەزگایەك ناتوانێ بۆ بەرهەمهێنانی باشـتر یان زیاتر، موچەیەکی زیـاتر بـدات. ئیمتیـازی مـادی بـەکردەوە بەدەسـت نایەت مەگەر بە بەرزبوونەوەی پلـەی کارەکـان. سـەرەڕای ئەمـەش وەهـا رێگایەك نە هەر بەرتەسکە (تەنیا بەشـێکی بچـووك لـە کرێکـاران دەتـوانن ببنـە سـەرۆك)، بـەڵکوو زۆر لەمپـەری کۆمەڵایەتیشـی بەدواوەیـە، چـونکە بزوێنەرێك بۆ بەرئەنجامی لانـی زۆری کـار فەراهـەم ناکـات، بـەڵکوو چـەند ئولگوویــەکی ســەرکەوتووی ســەقامگیر پــەرە پێــدەدات کــە دەرفــەتی لەبەرچاوگرتنی شایستەیی و تواناییەکانی تاك فەراهەم ناکات.

هەندێ کەس ناتوانن یان نایانـەوێ ئـەم رێگایـە بگرنەبـەر، لەئەنجامـدا لەژێر زەختی خواستەکانیاندا... ناچـار دەبـن بـۆ بەدەسـتهێنانی موچـەی

زیاتر تێبکۆشن، تاقە ڕێگەی دابینکردنی ئەم ویستانە، سەرفکردنی کاتی ئاسایش لە ڕێگەی کاری سوودهێنەر دایە.

ئێمە لە سەرەوەدا تێکۆشاوین تا جوابێك بەم پرسیارە بدەینەوە: چ شتێ تاکەکان ناچار دەکات تا کاتی ئاسایشی خۆیان بۆ بەدەستهێنانی پارە سەرف بکەن؟ ئێستە دەبێ مکانیزمێك بدۆزینەوە کە بازاڕ بە یاری ئەو دەتوانێ، ئەو هێزی کارە کە بەمجۆرە ئاراستە کراوە، وەربگریت.

زۆرێك لە کرێکارانی پسپۆڕ هەن کە حازرن لە دەرەوەی کاری ڕەسمی خۆیان، کارێکی هاوشێوەی ئەو ئەنجام بدەن، بەڵام بە بەهایەکی زیاتر لە کاری ڕەسمی. ئەمە بەو مانایەیە کە نە تەنیا کەرتی تایبەتی گەشە دەکات، بەڵکوو ژمارەی ئەو کەسانەی کە بێجگە لە کاری ڕەسمی کارێکی دیکە بەشێوەی یاسایی یان نایاسایی ئەنجام ئەدەن، بەخێرایی زیاد دەکات.[162]

داهاتی کاری ڕەسمی ئەوەندە نیە کە نیازەکانی خەڵك دەستەبەر بکات، بۆیە پێویستی موچەی زیاتر، بەشێوازی جۆراوجۆر خۆدەردەخات، ئەم موچەیەش زۆرجار تەنیا بە فیداکردنی کاتی ئاسایش فەراهەم دەبێت. بەمجۆرە دەورێکی بێهودە و تایبەت دەس پێدەکات، چونکە لێرەدا پرۆسەیەك دەس پێدەکا کە نائەقڵانیەتی خۆی لە ئاستێکی بەرینتردا بەرهەم دێنێتەوە. نیازە ڕاژەیەکان کە لەلایەن دام و دەزگای دەوڵەتی و هەرەوەزییەوە دەستەبەر نەکراون، نرخی کار لە بازاڕی ئازاددا زیاد

[162] ئەم کارە بە ئاوژووکردنی ڕەوتێك دەگات کە ماکس ڤێبر ئاوا ڕاڤەی کردووە: "کارخانە، ڕێژەیەکی ئێجگار بەرین لە هێزی کاری پسپۆڕ لەنێوان پاشەکەوتەکانی سەنعەتی بچوکدا بەکار دەگرێت، بە وتەیەکیتر، کارخانە بۆ سەنعەتی بچوك، دەرفەتی پەروەردەی هێزی کار فەراهەم دەکات، پاشان، کاتێ کە پەروەردەی ئەو بەئەنجام گەیشت، ئەم هێزی کارە لە سەنعەتی بچوك وەردەگرێت..."

دەکەن. لەم دواساڵانەدا نرخی کار لە بازاڕی ئازاددا لە موچەکان بەگشتی زۆر زیادی کردووە و لە هەندێ پیشەدا تا ڕادەی دوقاتی ئاستی موچەی رەسمی بەرزبۆتەوە... هۆکاری ئەم دۆخەش – ئاستی خزمەتگوزاری بەرزتری بازاڕی ئازاد، خەرج و ماڵیاتی کەمتر، و زەختی کاری زیاتر و رێکنەخراوتر– بەئاسانی رۆشن دەبێتەوە، بەڵام لێکدانەوەی بەرئەنجامەکانی ئێجگار ئاڵۆزترە. گرنگترین بەرئەنجام، خێراکردنەوەی رەوتی کارە. هەرچەند سەلماندنی ئەم خاڵە بە هۆ و بەڵگەوە نەختێ دژوارە، بەڵام دەکرێ بە یارمەتی ئەزموونی رۆژانە بەشێوەی لۆژیکی لەسەر ئەم گریمانە پێداگری بکەین کە جیاوازی نێوان نرخی کاری رەسمی و کاری بازاڕی ئازاد، دەبێتە هۆی دابەزینی بەرهەمهێنان و سەمەربەخشی کار. سستی و بێنەزمی لە کاردا– کە زۆرجار ئاماژەی پێدەکرێ– لە زۆر بابەتەوە، وشیارانە رێژەی بەرهەمی کار کەم دەکاتەوە، چونکە کرێکارێك کە لە ئەنجامدانی کاری رەسمیدا نیوەی موچەی کاری بازاڕی ئازاد وەردەگرێ، هەموو هێزو وشیاری خۆی سەرف ناکات. ماکس ڤێبر پێشتر ئەم راستییەی راڤەکردووە و گوتوویە کە "کەمی موچە، هاوتای هێزی کاری هەرزان نیە". چونکە زیادکردنی موچە هەموو جارێ هێزی کار "گرانتر" ناکا و نابێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی نرخەکان.

بەڵام ئەم بابەتە لەمەش ئاڵۆزترە: ئاستی نزمی بەهرەدانی هێزی کار، دام و دەزگاکان ناچاردەکات کە هێزی کار هەر لە نێو دام و دەزگاکانی خۆیاندا پاشەکەوت بکەن، ئەم کارەش بەردەوام هێزی کار کەم دەکاتەوە. دام و دەزگا دەوڵەتی و هەرەوەزیەکان بەگشتی نە تەنیا تێدەکۆشن تا کرێکارانێکی زیاتر بۆ خۆیان بپارێزن، بەڵکو خۆشیان وەك کڕیاری کاتی ئازادی کرێکارانی خۆیان دەردەکەون. تەنیا لەم دۆخە دایە کە دەتوانین تێبگەین کە بەپێچەوانەی هەموو هەوڵ و مکانیزمێکی

بەرتەسك كەرەوە، نە سەعاتی زێدەكاری كەم دەبێتەوە و نە كاری نێوەوەخت و دووهەم پیشە.

دۆخێك كە لە بواری كاتی زێدەكاریدا پێكهاتووە، دۆخێكی ئێجگار تایبەتە. سەندیكاكان بە سەرنجدان بە بەرژەوەندی كرێكاران، تێدەكۆشن سەعاتی زێدەكاری كەم بكەنەوە یان بیسڕنەوە. لە هەمان حاڵدا، كرێكاران، بەتایبەت ئەوانەی كە بێدەرەتانترن، تەنیا بە ئەنجامدانی زێدەكاری موچەكانیان قەبوڵ دەكەن.[163] ئەڵبەت زۆرجار خودی كرێكاران بارودۆخێك دروست دەكەن كە لە جەرگەی ئەودا بوار بۆ زیدەكاری دەڕەخسێت. بۆ نموونە هەندێ ئەرك و لێپرسراوی قەبوڵ ناكەن مەگەر ئەوە كە ڕێژەیەكی تایبەت زێدەكاری هەبێت. لەم دواساڵانەدا ئەم پرسە كاتێ ئاشكرا بوو كە مەزرا هەرەوەزییەكان... بوو بە ناوەندی وەرگرتنی هێزی كار...

بزاڤی بەردەوامی هێزی كار، تووشی هەمان بازنەی بێهوودە دەبێ و هەر بەوجۆرە كە ئەزموونەكان پیشانی داوە، ئەم دۆخە بە یاسا و ڕێسای دەوڵەتی چارەسەر ناكرێ.

بەكورتی ئەزموونەكان پیشانیان داوە كە كەمبوونەوەی سەعاتی كاری ڕەسمی ئەگەر لەگەڵ زیادبوونی موچە و داهاتەكان هاوكات نەبێت، یان ئەگەر داخوازی بۆ ئاسایشی واقعی لەنێو جەماوەردا پەرەنەگرێت، تەنیا وەك خەون و خەیاڵێك دەمێنێتەوە. لەراستیدا كرێكاران ناچارن بەشێوەی جۆراوجۆر هێزی كاری خۆیان لە كاتی ئاسایشدا بفرۆشن.

---

[163] F.Zweig لە تۆژینەوەی پێشوودا باسی دیاردەیەكی هاوشێوە دەكات. بەڕای ئەو، یەكێ لە داخوازییە هەمیشەییەكانی هێزی كار، دەرفەتی ئەنجامدانی ڕێك و پێكی زێدەكاری بە ڕادەی پێویستە.

بەلاّم گۆڕینی کاتی ئاسایش بۆ سەرچاوەی داهات، تەنیا هۆکارێك نیـە کە هـەر هۆمێـدێك وەك خۆشـخەیالّی لێـدەکات. تۆژینـەوەی کۆمەلّناسـانە پیشانی داوە کە سروشتی خودی کار –بە وتەیەکیتر: جێگـای [مـرۆڤ] لـە دابەشبوونی کاردا– هەموو ژیانی مرۆڤ و هەروەها شێوەی گوزەرانی کـاتی ئاسایشی ئەو دیاری دەکات. پێکهاتە هەنووکەییـەکانی دابەشـبوونی کـار، لـە خـودی بەسـتێنی کـاردا، لەئاسـت ئـازادی و خودموختـاری مرۆڤـدا لەمپەرێکی گرینگن. زۆربەی کرێکاران، کارێکی لاوەکی ئەنجام ئـەدەن کـە لە ڕوانگەی کۆمەلاّیەتییەوە کـارێکی بێمانایـە. لەلایـەکیترەوە، زۆر کـەس سەراسەری ژیانیان بە کارێکی تایبەتـەوە بەسـتراون کـە لـە منالّییـەوە تـا کـاتی خانەنشـینی درێـژەی دەبـێ. ئەمـە دواکەوتوانـەترین تایبەتمەنـدی سیستمی ئێستای بەرهەمهێنانە.

ئـــالّوگۆڕی شـــیاوی سیســـتمی بەرهـــەمهێنان، بـــەپێی بـــەها سۆسیالیســتییەکان، دوو پرســیاری بنــەڕەتی گەلالّــە دەکــات: دەبــێ چ ئالّوگۆڕێـك لــە سیســتمی دابەشــبوونی کــاردا پێکبێــت؟ چــۆن دەکــرێ کێشەکانی سەرەوە چارەسەر بکرێت؟

بەبێ چاوپۆشی لە پرسیاری یەکـەم... لێـرەدا تێدەکۆشـین پرسـیاری دووهــەم جــواب بدەینــەوە، چــونکە لــە بــەراورد لەگــەلّ بەلّگاندنــەکانی پێشوومان گرنگی سەرەکی هەیە.[164]

بلاّوبوونــەوەی حەشــیمەت لــە بەشــە ســەرەکییەکانی دابەشــبوونی کۆمەلاّیــەتی کــاردا، بــەپێی سیســتمی خوێنــدن و راهێنــان پێکهــاتووە.

[164] ئەم تۆژینەوە باسی بابەتێك ناکات کە زۆر جار بە پرۆسەی دیموکراتیزەکردنی مناسباتی کۆمەلاّیەتی ناودێر دەکرێت، بەڕای ئێمە، زۆرتر بەرهـەمی دەسەلاّتی کۆمەلاّیـەتی بەسـەر بەرهەمهێنەران دایە.

پرۆسەیەك كە بەو جێگایە دەگات كە تاكەكان بەدرێژایی هــەموو تەمــەنیان بــە پیشــەیەكی تایبەتــەوە ببەســترێن، هــەر لێــرەوە دەس پێــدەكات. سیستمی فێركاری خوێنـدكاران بـۆ ئـەوە پـەروەردە ناكـات كـە لـە ژیـانی خۆیانـدا ئامانجێكیـان هــەبێت: بــەڵكوو تــەنیا دەرفــەتیان پێــدەدات تــا پیشەیەكی تەواو تایبەت بەدەس بێنن. سیستمی خوێنـدنی ئێسـتای ئێمـە لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە سێ دەرفەتی جیـاواز لەبەرچـاو دەگـرێ كـە بەرۆشنی لە یەكتر جیادەبنەوە و پێكهاتەی كۆمەڵایەتی هەنووكـە بەرهـەم دێننەوە و بۆ بەرەكانی داهاتووش بەردەوامی پێدەبەخشن.

فێرگـەكانی دواناوەنـدی گشـتی "توێـژی رونـاكبیران"[165] و رێبــەرانی داهــاتوو و كارمەنــدانی داهــاتوو و كــادێرانی نێــوەنجی و پلــە خــواروو پەروەردە دەكەن.

پەیمانگــە فــەنی و هونەرییــەكان توێــژی كرێكــارانی پســپۆڕ و تكنیكزانەكان پەروەردە دەكەن.

**سەرئەنجام** ئەوكەسانەی كە بە تەواوكردنی قۆناغی سەرەتایی دەس لـە خوێندن هەڵدەگرن، زۆربـەیان كرێكـارانی ناپسـپۆڕ یـان نیـوە پسـپۆڕ[166] پێكـدێنن كـە لـە كۆمەڵگـەی ئێمـەدا لـە نـزمترین ئاسـتی پلـە و پایـەكانی پرستیژی كۆمەڵایەتیدا جێگیردەبن.

لە روانگەی تۆژینەوەكەی ئێمەدا سیستمی بارهێنانی كرێكارانی پسپۆڕ، گرنگییەكی تایبەتی هەیە. ئەمڕۆ ئەم بەشـە هـەم لـە بـەراورد لەگـەڵ ئـەو بەشـانەدا كـە خـولی فێركـاری بـەرزیان بینیـوە و هـەم لـە بـەراورد لەگـەڵ كرێكــارانی ناپســپۆڕدا بەشــێوەی قــورس و پتــەو بــە نێــو مناســباتی دابەشبوونی كاردا رۆچوون.

---

[165] Intelligentsia.
[166] Semi- Skilled.

بۆ تۆژینەوەی وردی ئەم بابەتە سەرەتا دەبێ رەوتە سەرەکییەکانی ئەم بوارە کە بەرهەمی گەشەی تکنۆلۆژین دەس نیشان بکەین...لە تۆژینەوەی دۆخی هەنووکەدا، دەتوانین سێ رەوتی بەرهەست بەدی بکەین:

ئەلف) گرنگترین ئالۆگۆڕ (تا جێگایەك کە بە رێژەیەکی ئێجگار بەرین بە کرێکارانەوە بەستراوە) جێگرکردنی کاری ماشینی لەجیاتی کاری دەستییە. ئەم پرۆسەیە لە سەردەمێکەوە دەس پێدەکات کە لە درێژەی ئەودا سەنعەتی پارچەچنی و سەنعەتی دەرهێنانی فلز دەرکەوتن، بەڵام لە زۆرێك لە بەشەکاندا ماشێنیکردن ئێجگار بەرتەسك مایەوە...لە چوارچێوەی ئەم ئالۆگۆڕەدا، کاری پسپۆڕانە جێگای کاری دەستی نەگرتەوە، بەڵکوو زیاتر کاری نیوە پسپۆڕانە جێگای ئەوی گرتەوە...

ب) هاوکات لەگەڵ پرۆسەی سەرەوە، کار و پیشە کۆن و نەریتییەکان، خەسڵەتی خۆیان لەدەست ئەدەن و کاری نیوە پسپۆڕانەی بەرهەمی پێشکەوتنی فەنی جێگەیان ئەگرێتەوە: زۆر کار و پیشەی جیاواز کەرت کەرت بوون و پیشە جۆراوجۆرەکان، وەك نەریتێکی باو دەرکەوتوون. ئەمرۆ بە دژواری دەتوانین لقێك لە کاری نەریتی بدۆزینەوە کە ئەم پرۆسەیە نەیگرتبێتەوە و هەر لەم پێوەندییەدا هەستکردن بە چاکسازی بنەڕەتی و بارهێنانی کرێکارانی پسپۆڕ وەك پێویستی دەرنەکەوتبێ.

ج) پێشکەوتنی فەنی، زۆر کاری تازە دێنێتە ئاراوە(زۆربەی ئەم کارانە، خەسڵەتی نیوە پسپۆڕانەیان هەیە، لەوانە: بەرپرسانی ماشێنە ئوتوماتیك و نیوە ئوتوماتیکەکان، تایپیستەکان و هتد) بەڵام تەنیا رێژەیەکی بەرتەسك پیشەی تازە پێکدێنێ (بۆ نموونە ئەوانەی دەزگای تەلەڤیزیۆنەکان مونتاژ دەکەن، پسپۆڕان و چاودێرانی

ماشێنەکانی خەتی بەرهەمهێنان). ئەم پیشانە تا رادەیەکی تایبەت لەگەڵ پیشە نەریتییەکان جیاوازن، یەکەم بەوهۆیە کە زۆربەیان پێویستی کەمتریان بە مەهارەتی دەستی و زانیاری فەنی گشتی و پسپۆڕی ئێجگار بەرینتر هەیە.

بنەما فەنییەکانی هەموو کار و پیشەکان بەردەوام لە حاڵی ئاڵوگۆڕ دایە. ئەم ئاڵوگۆڕەش زۆرجار قووڵ و بەرینە و ئەو کارزانی و زانیاریە کە پێشتر پێویست بوو، بەخێرایی باتڵ دەکاتەوە. ئەم راستیە، لەخۆیدا، سەرەڕای پرۆسەی یەکسانسازی[167] کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، کاتێگوری کرێکاری پسپۆڕ و ناپسپۆڕ رەتدەکاتەوە و لە هەمان حاڵدا پێکهێنانی سیستمێکی فەنی و پرۆفیشناڵی تازە دێنێتەئاراوە.

لە هەنگاریا، رێژەی لاوانی راهێنراوای پسپۆڕ لە 1953تا 1965چوار بەرابەر بووە. ناکرێ ئەم کارە بە نیازەکانی پرۆسەی فەنی راڤە بکەین، چونکە لە سوئێد ئەم رێژەیە تەنیا 27/6٪ لە نەمسا 44٪ و لە ئیتالیا 46/5٪ بووە. ئەم رەوتە بۆتە هۆی ئەوەی رێژەی ئەو لاوانەی کە پاش قۆناغی سەرەتایی خوێندن بەجێ دێڵن و لە بواری کاری فەنیدا خۆیان رادەهێنن زیاد بکات.

لەلایەکیترەوە بە بیانوی هەوڵدان بۆ دوور ڕاگرتنی لاوان لە ناهومێدی لە کارەکانیدا، ویست و داخوازیەکانیان کەم کردۆتەوەو تا لەگەڵ ئاستی ئێستای دابەشبوونی کار سازگاری بکەن، بەمبۆنەوە ئەوانیان بەرەو ناوەندی فێرکاری پسپۆڕانە رێنوێنی کردووە، پرخەسارترین کاریگەری ئەم دیاردەیە بەرۆکی ئەو لاوانە دەگرێتەوە کە لە مناڵیەوە لە دۆخێکی ناشیاودا بەسەریان بردووە.

[167] Egalisation.

کەوابوو دەتوانین سیستمی ئێستای راهێنانانی کرێکارانی پسپۆڕ هەم لە روانگەی سەمەربەخشیەوە بنرخێنین و هەم لەرووی پێوەرە سۆسیالیستەکانەوە... ئاشکراترین ناکۆکی سیستمی ڕاهێنانی کرێکارانی پسپۆر لێرەدا شاراوەیە کە کارە نیوە پسپۆڕانەکان، بەهۆی سیاسەتی هەقدەستەکان و هوکاریتر، بە کاری پسپۆڕانە ناودێرکراون (بەتایبەت لە پیشەسازی سووك، لە بازرگانی و سەنعەتی خۆراکدا)، هەرچەند پسپۆرییە پێویستەکان بۆ ئەم کارانە نەگۆڕاوە.... ئەم کارە دەبێتە هۆی بێبایەخی هێزی کاری پسپۆڕ و ئەو کارانەی کە زانیاری تایبەتیان پێویستە، جگە لەمەش ناتوانین ئەم راستیە فەرامۆش بکەین کە بەڵگەنامەی کرێکاری پسپۆڕ کە بە هەوڵی زۆر یان کەم بەدەس هاتووە، ئەوان لە بوارێکی لاوەکی لە پیشەکەیاندا سەقامگیردەکات.

کاتێ کە لە چوارچێوەی کارێکی نیوە پسپۆڕانەدا، کێشە و دژواری ئامادەکاری دەرکەوێت، بواری ناوبراو، بە پێشەیەکی پسپۆر ناودێر دەکرێت. سەرەڕای ئەمەش، لەو بوارانەدا کە ژمارەی خوازیاران بەڕادەی پێویست نیە، جۆرێك راهێنانی بەناو "پلە بەرز" گەڵاڵە دەبێت. بۆ نموونە، بارهێنانی ئەو کرێکارانەی کە بۆ بەشی فرۆشتنی پیشەسازی خۆراك لەبەرچاو گیراون، لەئاستی "پلە بەرز" دایە، بەپێچەوانەی ئەوەی کە زانیاری پێویست بۆ وەها پیشەیەك بەسانایی بەدەست دێت، جگە لەوەش دەبێ چەندین زانیاری بەردەوام تازە فەراهەم بێت (لەمەڕ تایبەتمەندی کاڵا تازەکان، شێوازەکانی بەهرەمەندی لەوان و مێتۆدە تازەکانی بازرگانی و هتد). ناکۆکی نێوان کرێکارانی (ناپسپۆڕ) کە

ئـەزموونی كارییـان هەیـە و ئەوكەسـانەی كـە ئـەزمونیان نیـە، بـەڵام بەڵگەنامەی پەروەردەیان هەیە، لەم پرۆسەوە سەرچاوە دەگرێ، چونكە بۆ زۆربەی كار و پیشەكان، گرنگی پراتیك – لە پێوەندی لەگەڵ هەندێ توانـایی شەخسـیدا ـــ لـە زانیـاری فەراهـەم بـوو لـە درێـژەی ڕاهێنـانی پسپۆڕانە، زیاترە.

فێركاری تیۆریك بـەڕادەی پێویسـت كاریگـەر نیـە، چونكە لـە پراتیك جیاوازە، ئەمەش بەپێچەوانەی ئەوەیە كە لە ناوەندی ڕاهێنانی كرێكـارانی پسپۆڕدا، كاتی تەواو بۆ فێربوونی كارێك و بەئـەزموون بـوون لەئارادایـە. پرسـەكە بـەمجۆرە چارەسـەر نابێـت چـونكە لـە ڕاهێنـانی كرێكـارانی پسپۆڕدا، هەروەك ئێستا باوە، زیاتر گرنگی بـە ڕاهێنـانی گشـتی ئـەدرێت لەچـاو پسـپۆڕی تایبـەت. (لـە دە سـاڵی ڕابـردوودا ڕێـژەی ئـەو كارانـەی خولیان بۆ كراوەتەوە لە هەموو وڵاتان و هـەروەها لـە هـەنگاریا، زۆر كـەم بۆتەوە). ئەمە پیشان ئەدات كە لە ڕاهێنانی كرێكارانی پسپۆڕدا، زانیـاری فەنی و گشتی لە توانایی تایبەتی گرنگترە.

بەڵام ئـەم پرسـە پێوەنـدی بـە سیسـتمی پـەروەردەوە نیـە (زۆربـەی شاگردەكان بـوارە تیۆریكـەكان بـەجێدێڵن، چـونكە لـەم ناوەندانـەدا، بـە ویسـتەكانیان ناگـەن) بـەڵام بـەم گۆڕینـەی بوارەكـان تـەنیا لـە ئاسـتیكی سنورداردا بە ئامانج دەگەن.

ناوەنـدەكانی پـەروەردەی كرێكـارانی پسـپۆڕ، بەتایبـەت ئەوانـەی كـە بەڵگەنامەی قۆناغی دواناوەندی دەردەكەن دەبێ ئەركێكی گـرنگ ئـەنجام بدەن: بەرزكردنەوەی ئاستی فەرهەنگی گشـتی شـاگردەكان، ڕەنگـە ئـەم

کارە بتوانێ لە کەموکورتی دەرفەتە کارییەکانی ئەوان پێشگیری بکات، بەڵام بەکردەوە لە بەین ئاستی ئەو فەرهەنگە گشتیەدا کە فێرگەکانی دواناوەندی و پەیمانگە فەنییەکان ئاراستەی دەکەن، مەودایەکی قووڵ هەیە و ئەم مەودایە مافی تکنیکخوازی پەیمانگەکان بۆ درێژەدان بە خوێندن لە زانکۆکاندا بەتەواوی ناهەموار دەکات. ئەم دەرفەتە تەنیا بە نەسیبی چەند کەسێکی دەگمەن دەبێ کە هۆش و لێهاتوویی شازیان هەیە. شیاوی وەبیرخستنەوەیە کە بەپێی یەکێ لە تۆژینەوەکانی وەزارەتی کار کە ساڵی 1970 ئەنجامدراوە تەنیا 12/3٪ خوێندکارانی پەیمانگەکان خوازیاری فێربوونی کارێکی پسپۆڕانەن.

هەروەها دەبێ ئەم راستیەش لەبەرچاو بگرین کە کۆمەڵگای ئێمە لاوەکان لە تەمەنێکدا ناچار بە هەڵبژاردنی پیشە دەکات کە خاوەن سەربەخۆیی نین. بەمجۆرە ئەوان ناچار دەبن بەدرێژایی هەموو تەمەنیان کارێك ئەنجام بدەن کە بەشێوەی یوتۆپیایی هەڵیان بژاردووە.

کەموکورتی هەڵبژاردنی پیشەکان بە بەرنامەڕێژی گەشە دەکات، چونکە بەرنامەڕێژی رێژەی پێویستی کرێکاران لە چەندین کاری جیاواز و هەروەها لە چەندین پیشەی تایبەتدا لەبەرچاو دەگرێ و لەئاکامدا چەن گەلاڵەیەکی سرویسی دیاریکەر دادەڕێژێ. لەم روانگەیەدا تەرکی خوێندن ـ راست وەك تەرکی کار ـــ بە دیاردەیەکی نگەتیف حساب دەکرێ کە دەبێ بە چەندین مێتۆدی ئیداری، دەروونی ـ فەنی یان تەنانەت کۆمەڵایەتی ـــ فەنی لەدژی ئەو خەبات بکەین. سەرەڕای ئەمەش لە هەندێ کاردا، رێژەی ئەو کرێکارانەی کە کارەکانیان بەجێدێڵن بە وەها

ئاستێك دەگات کە خەسڵەتی لاوەکی خودی پرسەکە، پرمەترسی دەبێت، بۆ نموونە ـ بەپێی تۆژینەوەی وەزارەتی کار کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، رێژەی شاگردانی پەیمانگەی کشت و کاڵ کە خوێندن بەجێ دێڵن 42/4٪ لە سەدە. هەر بەوجۆرەی کە بەڵگەکان دەری دەخەن، یەك لە سێی دیپلۆمەکان لە پیشەیەکی تردا کاردەکەن. رێژەی گۆڕینی کار لەنێوان لاوانی کرێکاری پسپۆڕدا لە سەرەوەیە. ئایا دەکرێ ئەم دیاردەیە بە مکانیزمی ئیداری چارەسەر بکرێت؟

ئەو راستیانەی ئاماژەیان پێکرا و قسەی سەر زاری هەموانە بەئاشکرا قەیرانی پەروەردەی پسپۆڕانە دەردەخەن. بەڵام رەنگە ئەم تێزە بە چەن رێگەچارەیەکی جیاواز بگات – تا ئێستاش تا رادەیەك گەیشتووە. سەرەڕای چەندین پێشنیاری فرەچەشن کە تا ئێستا ئاراستەکراوە، بە تۆژینەوەی پێکهاتەی بابەتەکە، دەتوانین دوو رەوتی بنەرەتی بەتایبەت لەمەڕ پێوەندی شیاوی نێوان پەروەردەی خوێندنگەکان و ناوەڕۆکی دابەشبوونی کار جیابکەینەوە.

لایەنگرانی رەوتی یەکەم (بە پراکتیزەکردنی رێفۆرم لە سیستمی پەروەردەی هەنووکەدا) لەمەڕ کەموکورتییەکانی سیستمی پەروەردە داوەری دەکەن و هەندێ لەو خاڵانەی کە پێشنیاری دەکەن شایانی سەرنج پێدانە. بەڵام ئەم پێشنیارانە ناتوانێ دۆخی ئێستا بگۆڕێ، چونکە گەوهەری ئەو ناگۆڕێت، چونکە ئەم رەوتە ئەو هۆکارانە لەبەرچاو ناگریت کە مرۆڤەکان بەدرێژایی تەمەنیان لە پیشەیەکی تایبەتدا یەخسیردەکات. بەپێچەوانەوە، ئێمە دەرفەتی گەشەی سیستمێك بە هەموار دەزانین کە

ڕێخستنی بەرهەمهێنان و پەروەردەی خوێندنگاکان لێکهەڵپێکی، سیستمێك کە جیگای مرۆڤ لەنێو سازمانی دابەشبوونی کاردا بۆ هەموو تەمەن دیاری نەکات، بەڵکوو وەها دەرفەتێك بە مرۆڤ بدات تا بەردەوام لێهاتوویی و تواناکانی خۆی بدۆزیتەوە و ناسنامەی خۆی ببینێتەوە، سیستمێك کە چەندین هەل و دەرفەت بخولقێنێ تا کرێکار بتوانێ لە هەموو ساتەکانی ژیانیدا کار و پیشەکەی بگۆڕێ.

بۆ چەسپاندنی وەها سیستمێك، دەبێ پێوەندی پێکهاتەیی نێوان سیستمی گشتی ئێستا و پەروەردەی فێرگەیی و دنیای کار بپچڕێنین.

ئەرکی سەرەکی سیستمی پەروەردە کە سرویسی پەروەردەی گشتی ئاراستە دەکات، ڕاهێنانی مرۆڤ وەك بونەوەرێکی ئینسانیە نە کرێکارێك کە پێڕەوی دابەشبوونی کارە. بە وتەیەکیتر، ئەم ئەرکە بریتییە لە ئامادەکردنی تاکەکان بۆ زاڵبوون لەسەر مناسباتی کۆمەڵایەتی خۆیان، بۆ دیاریکردنی وشیارانەی چارەنووسی خۆیان.

بەپێی ئەم مۆدێلە دەبێ زانیارییە گشتییەکان بەشێوەی ئورگانیك لە فێرگەوە ئاراستە بکرێت کە بژارتن نە تەنیا بە قسە بەڵکوو بە کردەوە بسرێتەوە. سیستمی پەروەردەی پسپۆڕانە، لە چەندین ئاستی جیاواز و لە چەندین شێوازی جۆراوجۆردا دەبێ بەشێوەی ڕۆشن لەو جیابێتەوە. ئەم سیستمە بەپێچەوانەی سیستمی پێشوو زانیارییەکان و تواناییەکان بۆ بەشداری لە لقێکی تایبەت لە دابەشبوونی کاردا پێکدێنێ.

لەم ڕوانگەیەدا، ناوەندە پسپۆڕییەکان کە لەئاست هەموان کراوەن، لەگەڵ فێرگەکانی سەرەتایی پێوەندییان دەبێت. هەندێ لەوانە زۆر

زانیـاری پرۆفیشـنال و بنـەرەتی، تایبـەت و لێهاتووییـەکان لەئاسـتی جیاوازدا پێشکەش دەکەن، لەکاتێکدا فێرگە پسپۆڕییەکانی دیکە، تـەنیا هەندێ کار یان هەندێ پیشە فێردەکـەن. ئـەم فێرگـە پسـپۆڕییانە دەبـێ لەئاست هەموو ئەوکەسانە کە زانیاری پرۆفیشنالی بنـەڕەتی یا گشـتییان هەیە، کراوە بن و دەرفەتی تەواوکردنی خوێندن بۆ ئـەوان فەراهـەم بکـەن خەسڵەتی کـراوە و دیـاری نـەکراوی ئـەم مۆدێلـە، لـە گـۆڕانێکی بنـەمایی گرنگی زیاتری هەیە، چونکە هەڵوەشاندنەوەی بـەکردەوەی ئـەو لەمپـەرە کۆمەڵایەتیانـە هـەمواردەکات کـە لـە بـەردەم بێبەشـترین کەسـەکاندا دەوەستن.

هـەر گرنگیـەك کـە بـۆ بەرابـەری دەرفەتـەکان و نـاوەرۆکی کۆمـەڵگای کـراوە قایـل بـین، ئەگـەر ئـاڵوگۆڕی قـووڵی بنـەڕەتی روونـەدات، هـەموو شتەکان هەر لـە ئاسـتی خـەون و خـەیاڵی ئـازادی خوازانـەدا دەمێننـەوە. بـەبێ ئـاڵوگۆڕی بنـەرەتی، پێکهاتـەی ئێسـتای کۆمـەڵگا لـە شـکڵە سـەرەکیەکانی خۆیـدا بەرهـەم دێنێتـەوە و سـەرئەنجام وەك خـۆی دەیپـارێزێ. لـە ئـاڵوگۆڕی لـەم جـۆرەدا گـرنگترین خـاڵ دروسـتکردنی کونترۆڵی کۆمەڵایەتی بەسەر دەسەڵاتی ئیداری دایە.

بەڵام بـۆ گەیشـتن بـەم ئامانجـە ئاسـتی بـەرزتری پـەروەردەی گشـتی پێویستە...

ناتوانین حاشای لێبکەین کـە بەگشـتی ئـەو کرێکارانـەی کـە خوێنـدنی دواناوەندییان تەواو کردووە لە کارەکەی خۆیان چاوەڕوانی زۆریان هەیە و زۆرجار پیشە دەسـتییەکان ناتوانـێ ئـەم چاوەڕوانیە دابـین بکـات. بـەڵام

کۆمەڵگا دەبێ لە وەها خواست و داخوازییەك بەهرەمەند بێت، چونکە بە یارمەتی ئەوانەیە کە چەندین ئاڵوگۆڕی فرەچەشن و ئەکتیڤ لەناخی ڕێخراوی کاردا دەچەسپێت.

ئاکامی سروشتی ئەم سیستەمە پێشنیارکراوە، پێکهێنانی سیستەمی پەروەردەی ڕێك و پێك و بان پسپۆڕییە بە دوو مانا. لەلایەکەوە بە وەها سیستەمێکی پەروەردەوە، زۆربەی کرێکاران بە ئاستی فێربوونی گشتی دەگەن کە لە فێربوونی هەندێ کاری لاوەکی، بەرزترە. لە هەمان حاڵدا، ڕێژەی ئەو کرێکارانەی کە پەروەردەی پسپۆڕانەیان دەرفەتی کار و پیشەیان بۆ دەڕەخسێنێ لە ڕێژەی پێوست زیاتر دەبێت. ترس لە وەها سیستەمێکی پەروەردەیی بان پسپۆڕی، لە ڕوانینی ڕەخنەگرانە بۆ کۆمەڵگا پێشگیری دەکا و یەکێ لە ئاستەنگە سەرەکییەکانە کە لە بەردەم پێکهێنانی ڕێخراوی بەرهەمهێنانی سازگار لەگەڵ پێوەرە سۆسیالیستیەکان دایە.

ئێمە پێمان وایە کە دەبێ جۆرێك ڕێخستنی مودێرنی کار گەشە پێبدەین کە بە سەرنجدان بە ئاستی فەنی دیاریکراو، خودموختاری و بەرپرسایەتی گەشندە و هەروەها دەرفەتی بەرینبوونەوەی بڕیاردان بۆ هەر کرێکارێك فەراهەم بکات. کرێکار ئیتر لەژێر زەختی دەسەڵاتخوازانەدا ئەرکی خۆی ئەنجام نادات. بەڵکوو لەجیاتی ئەو وەك بەرپرسی کارێکی تایبەت دەور دەبینێ. کرێکارانی پەروەردەکراوتر کە ویست و داخوازی گرنگتریان هەبێت، دەتوانن زۆر ئاڵوگۆڕی فەنی دابهێنن، کە لە ئاڵوگۆڕی ئابووری گرنگتر بن.

ئەگەر رێژەیەكی بەرین لە كرێكاران ئاستێكی فەرهەنگی بەرزیان هەبێت، و ئەگەر دۆخی گشتی كار باش ببێت، ئەگەر توێژێكی نوێ لە كرێكارانی گەشە بكات، گرنگی حەیاتی هەیە. ئەم توێژە دەتوانێ كونترۆڵی كۆمەڵایەتی واقعی لە هەموو ئاستێكی بەڕێوبەریدا بەدەستەوە بگرێ و بەئەنجامی بگەیەنێ. لە هەمان حاڵدا، ئەندامانی ئەم توێژە وەك گرووپێكی ئینسانی دەرفەتی بزاڤی زیاتریان دەبێت.

لەڕاستیدا سیستمی پەروەردەی بان پسپۆڕی كە ئامانجی ئەو ئاراستەكردنی بارهێنانی گشتی بەرزترە، ئیتر لەگەڵ رەخنەی تیۆریك بەرەوڕوو نیە. ئەو رەخنەیانەی كە هەن بەگشتی لەسەر رەخنەی پراتیكی راوەستاون و بەر لە هەر شتی دەگەڕێنەوە بۆ ئەم نگەرانیە كە ئەو ویست و داخوازییەی بەرهەمی ئاستێكی بەرزتری فەرهەنگن، دابین نەكرێن و ببنە هۆی رەخنە و نارەزایەتی. پاشان تێبینی ئابووری دێتە ئاراوە: "سەرچاوەكانی" پەروەردە كە ئیمكانی نیە بەشێوەی راستەخۆ لە بەرهەمێنانی كۆمەلایەتیدا بەكار ببرین، زیادی حساب دەكرین.

دۆخەكە لەمەڕ سیستمی پەروەدەی بان پسپۆڕی، جیاوازە، یانی لە بابەتێكدا كە رێژەی ئەوكەسانەی كە كارێك فێر دەبن لە رێژەی پێویست، زیاترە. نگەرانییەكانی پێشوو – لەمەڕ نارەزایەتی و اسراف – لەلایەن دوو روانگەی سیاسی، یان ئایدیۆلۆژیكەوە گەشەیان پێدەدرێت كە تا رادەیەكی زۆر گرنگن: نگەرانی لە بێكاری پێكهاتەیی و نگەرانی لە ناوەرۆكی بەرنامەرێژی نەكراوی ئەم دیاردەیە. لەراستیدا، ئەم روانگانە سیستمێك رەت دەكەنەوە كە لە رێگەی پێكهێنانی سازگاری لەنێوان

ڕێخراوەکانی بەرهەمهێنان و سیستمی پەروەردەدا تێبکۆشی و ڕێژەی کار و پیشە جیاوازەکان بەروشنی دیاری بکات.

سەرەڕای ئەمەش ئەگەر کۆمەڵگایەکی بەراستی کراوە لەبەرچاو بگرین، پەروەردەی بان پسپۆڕی لە هەموو کار و پیشەکاندا نە تەنیا هۆکارێکی سەرەکیە بۆ گەشەپێدان بە پانتایی خودموختاری تاك، تا بتوانێ شیاوترین جێگا لەنێو سیستمی دابەشبوونی کاری ئێستادا بدۆزێتەوە، بەڵکوو بۆ گۆڕینی بنەمایی ئەکتیڤیش کە لەجیاتی سازگارکردنی مرۆڤ لەگەڵ پیشەکەی، پیشە لەگەڵ مرۆڤ سازگار دەکات، زۆر پێویستە. بە وتەیەکیتر ئەمە تاقە شێوازی پێکهێنانی دۆخێکە کە لەودا تاك دەتوانێ بەکردەوە لەنێوان کار و پیشە جۆراوجۆرەکاندا دەست بداتە هەڵبژاردن و لە هەمان حاڵدا ئەو دەرفەتەش بۆ کۆمەڵگا لە هەڵبژاردنی چەندین کاندیدای فرەچەشندا دەرەخسێنێ. ئەم پرۆسەیە بێگومان لە درێژەی کاتی کاری ڕەسمیدا، خێرایی کار زیاتر دەکات. تێکرای ئەم دۆخە سەرئەنجام هەلومەرجێك دەڕەخسێنێ کە لەودا زیاترین بەشی کاتی دەرەوەی کار دەتوانێ وەك کاتی ئاسایشی واقعی دەرکەوێت، هەلومەرجێك کە دۆخی باسکراوی بەشی یەکەمی ئەم وتارە لەنێو دەبات. کرێکار لە وەها دۆخێکدا موچەیەکی کەم وەردەگرێ و لەئەنجامدا، لە درێژەی سەعاتی کاری ڕەسمیدا، کاری خۆی بە خێراییەکی کەمترەوە ئەنجام ئەدات. ئەو داهاتی خۆی بەو موچەیە کە لە دەرەوەی کاتی کاری ڕەسمی بەدەستی دێنێ، زیاد دەکات. سیستمی پەروەردەی بان پسپۆری کە لە سەرەوە باسکرا، چەندین بزوێنەر بۆ تاکەکان

دەخولقێنێ تا کار و پیشەکان ئازادانە هەڵبژێرن و کاتی ئاسایشی زیاتریان بۆ گەشە و پشکووتنی خۆیان سەرف بکەن.

بەڕای ئێمە، ڕێك هەر لێرە دایە کە لەلایەکەوە پێوەندییەکی تازە لەنێوان ئاڵوگۆڕی پێشنیارکراو و ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە سەردەمێکە لە ڕێخراوی بەرهەمهێنان و پرسی ئاسایشدا، چاوەڕوانی دەکەین، و لەلایەکیترەوە لەنێوان سیستمی پەروەردەی گشتی و سیستمی پەروەردەی پسپۆڕانەدا هەموار دەبێ تا مرۆڤ بۆ تێکۆشانی ئازادانەتر لە دوو بواری ژیاندا ئامادە بێت، بەجۆرێك کە بتوانێ خودموختاری خۆی گەشە پێبدا و وەك ئینسان بە گەشەی تەواو بگات.

## هەڵەکانی چەگوارا

**میکولوش هاراستی**

(1)

**ئایدیالیزم**

بەهۆی نەناسینی یاساکانی رێبەری
قەت نەیتوانی خۆشەویستی خۆی
لەسەر بنەما بەرهەستەکان دابرێژێ.

بۆ بەرخۆدان لەئاست دەنگۆکان
لە کۆڕ و متینگاندا
رازی دەسەڵاتدارانی
بۆ جەماوەر دەوتەوە.

(2)

**هاودەستی**

لەگەڵ ئەمریکییەکان تەواو هاودەنگ بوو
زۆر بەڵگەی روون بەدەستەوەن
کە بە نهێنی خەریکی ئاشتی و سازان بوو
بۆ وێنە
بە ڕادەی ڤێتنامی دەویست
کە ئەمریکییەکان،
بێ یەکێ کەمتر

(3)

**دووڕوویی**

دووڕوویی ئەو لەوەدابوو

کە بە هێزی وتەکانی خۆی

بڕوای نەبوو

بەردەوام دەیوت

شۆڕشێك لەئارادا نیە و نابێ

ئەگەر کەسێ بۆی نەجەنگێ

(4)

**چە پڕەوی**

جۆرێك ئەخلاقی کار لەپێناو کاری ستایش دەکرد

بەڵام لەڕاستیدا

سەرسەختانە نکۆڵی لێدەکرد.

پارە

بایەخی هەموان دیاری دەکاو

بەرەو کاری قارەمانانە هانمان ئەدا

(5)

**ئاژاوەگێڕی**

لەوپەڕی کامەرانیدا
بنەماڵەکەی بەجێهێشت
بنەماڵەیەکی پڕحەشیمەت

چەندین پیشەی شکۆمەندی
سەرۆك بانك، پزیشك و وەزیری
بە ناوبانگی بەڕێزی میلیشیای پێشوو گۆڕیەوە.

(6)

**رڤیزیۆنیزم**

خۆی بە مارکسیست دەزانی
بەڵام بەشێوەیەکی سەمەرە
لەو شتەی کە هیۆمانیزم لە دوو هەزار ساڵ پێشەوە
دەیوتەوە، بێخەبەربوو.

نەیدەزانی ئەوەی بە تفەنگ بجەنگێ
رۆژێك بە تفەنگ دەکوژرێ.

## شۆڕش یان بشێوە؟

**رافیش هایدۆ**

(...) شاعیرێکی لاو لـە بـەرەی نـوێ تێدەکۆشـێ بـەناوی مارکسـیزمی چەواشەوە لە ئاست مارکسیستەکان داکۆکی لە چەگوارا بکات. (هەڵەکانی چەگوارا، Uj Iras, 12, 1969).

ئەگەر تەنیا ئەم بابەتـە لـەئارادا بایـەت دیـالۆگ لەمـەڕ ئـەو بێسـەمەر بـوو. بەرهـەمی ئـەم شـاعیرە هـەوڵێکی بێهوودەیـە کـە دەیـەوێ فکرێکـی شلەژاو بکاتە شیعر. نووسەر هونەری شیعر دەناسێ، بەڵام ئـەم شـیعرەی سەرکەوتوو نیە.

شـــاعیری لاو بـــە لووتبەرزیـــەکی بێشـــەرمانەوە، کـــە زۆر جێگـــەی سەرسوڕمانە، رەخنە مارکسیستییەکان لە رێبازی چەگوارا رەتدەکاتـەوە، بەڕای ئەو ئەم رەخنەیە تەنیا تۆمەت و بەدناوکردن بووە.

بەپێچـەوانەی مرۆڤدۆسـتی والاّ و مـەرگی تراژیـك و خـەماوی چـەگوارا، تۆژینەوەی ئەوە کە بۆچی دەبێ مارکسیستەکان لەمەڕ تاکتیك و ستراتژی ئەو باس و دیالۆگ بکەن و هەروەها دیالۆگ لەگەڵ لایـەنگرانی ئەندێشـەی ئەو کە دەیانەوێ لـە تیـۆری و پراتیکدا بیچەسـپێنن، زۆر لـە باسـەکەمان دوورمان دەخاتەوە.

بێگومـان چـەگوارا کەوتۆتـە بـەر هێرشـی نـاڕەوای چـەندین تـاقمی سکتەوە. بەڵام رەخنەی چەپی شاعیری لاوی ئێمە، لەراستیدا ستایشـێکە لەو شتەی بە خەیاڵی ئەو، مارکسیزم دەبێ وابێ، رەخنەیەك لـە دژی ئـەو مارکسیستانەی کـە بـە کونسـرڤاتیڤ و سازشـکار نـاوبراون. شـیعری ئـەو هەموو رەخنەگرانی چەگوارا دەگرێتەوە.

خـاڵێکی جێگـەی سـەرنج ئەوەیـە کـە شـیعری ئـەو لـە کەسـێتی ئـەو سەرتردەچێ و ئێمە لەگەڵ رەوتێکی مەعنەوی و ئەخلاقی بەرەوڕوو دەکا کە لە بازنەیەکی — بەرتەسکدا — لەنێوان لاوانی رۆشـنبیری وڵاتـی ئێمـەدا باوە و مەترسی ئەوە هەیە پەرەبگرێ.

مەبەستی من چەپرەوییە کە نوێنـەرانی ئـەو خوازیـاری "دیموکراسـی بێسنوور"ن و بانگەشەی "خۆنەویستی شۆڕشگێڕانە" دەکەن.

من پێموایـە دەبـێ لـە روانگـەی مارکسیسـتییەوە رەخنـە لـەم رەوتـە بگرین.

لەم دوا ساڵانەدا، بەشێکی — بەرتەسك — لە لاوانی رونـاکبیری وڵاتـی ئێمە رادیکاڵتر بوونەتەوە. ئەم دیاردەیە سەرەڕای هەنـدێ لایـەنی بـاش و پێویست، بە رێگایەکی چەوتدا دەڕواتەپێش. ئێستا ئاشکرا دەبێ کـە ئـەم نەخۆشـییە منداڵانەیـە کـە لەمێـژە ناسـراوە، خەریکـە بەشـێوەیەکی نـوێ دەردەکـەوێ، بـە چـەندین فکـری تێکـەڵ و پێکەڵـەوە، چـونکە لەگـەڵ سەنتێزێکی نارەخنەگرانە لە ئەندێشەکانی رژی دۆبـرە، مـائو، و چـەگوارا، یان ئەندێشەی بزاڤی خوێندکاری رۆژاوایی بەرەوڕووین.

ئێمە ناتوانین ئەم روانگەیە قەبوڵ بکـەین... ئێمـە دەبـێ لـە چـەندین باسی تایبەتدا و هەروەها لە بەرهەمـە هونەرییەکانـدا ئـەم فکـرەی چـەپی توندڕەو لە هەموو ئاستەکانی ژیانی فکریدا وەك هێزێکی زیندوو و کاریگەر لەقەڵـەم بـدەین. ئەندێشـەی "دیموکراسـی بێسـنوور"و "خۆنەویسـتی شۆڕشـگێڕانە" چـونکە زۆر پـەرەیان سـەندووە، لـە هـەموو گـرنگترن. نووسەری لاو لە شیعرەکەیدا داکۆکی لەم فکرانە دەکا.

نووسـەر وادەنوێنـێ کـە لەگـەڵ ئـەو رەخنەیـە کـە شـێوەی رێبـەری چـەگوارا لەمـەڕ دیموکراسـی و دەرسـەکانی لەمـەڕ تاکتیـك و سـتراتیژی، هاودەنگە، بـەڵام لەراسـتیدا، بـەکردەوە ئـەم رەخنەیـە رەت دەکاتـەوە و بەشەیداییەوە هەڵەکانی چەگوارا ستایش دەکات.

روناکبیرانی لاوی ئێمە — ئەوجۆرەی کە لە باس و راگەیاندنی زۆردا بەیان کراوە — داوای دیموکراسی رەها دەکەن.

لایەنگران و خوازیارانی دیموکراسی رەها لە بیریان دەچێ کە دیموکراسی کاتێگورییەکە بە مناسباتی چینایەتییەوە بەستراوە و یەکێ لە توخمە پێکهێنەر و گرنگەکانی ئەوەیە کە بەرژەوەندی چینایەتی بەیان دەکا و لەئەنجامدا بەناچار ئیمکانی چەسپانی نیە مەگەر ئەوە کە بەرتەسك بکرێتەوە.

دیموکراسی سۆسیالیستی ئیستای ئێمە، لە سەردەمی خەباتی چینایەتی لە ئاستی جیهانیدا، لایەنگری بەرژەوەندی دوو چینی بنەڕەتی رێبەر و هاوپەیمان و ئەو توێژانەیە کە بەوان پەیوەست بوون.

ئەگەر سنوورە پێویستەکانی ئەمڕۆ هەڵوەشێنینەوە، لەراستیدا دیموکراسی سۆسیالیستیمان هەڵوەشاندۆتەوە کە پیشاندەری بەرژەوەندی حەیاتی حکومەتی چینی کرێکار و جوتیاران — ی هاوپەیمان— ـە.

دەبێ لەو تەگەرە و کەموکوڕتییە سەرەڕۆیانە رەخنە بگرین کە لەجیاتی خزمەت بە دیموکراسی سۆسیالیستی واقعی، خزمەت بە دیموکراسی تاقم و گرووپی کاربەدەستانی دەوڵەتی دەکەن.

بەڵام ناکرێ ئەم رەخنەیە بە دەستەواژەی ئابستراکت ئاراستە بکەین کە ناکۆکی تایبەت بەخۆی هەیە: چەمکی دیموکراسی رەها. خواستی خۆنەویستی شۆڕشگێڕانە، تەنیا بژارێکە کە رەخنەی پێویست لە دیاردەکانی وردەبورژوازی لەنێو ئێمەدا دەشارێتەوە.

لایەنگرانی خۆنەویستی بنەمای پاداشی مادی رەت دەکەنەوە، ئەوان پێیانوایە کە هاوکات لەگەڵ گەشەی ئاسایشی چینی کرێکار، ورەی شۆڕگێڕانەی ئەو کزدەبێت.

ئەم بۆچوونە هەم لەگەڵ روانگەی مارکسیستیدا لە ناکۆکی دایە و هەم لەگەڵ شێوەژیانی سۆسیالیستی ئێمەدا. زۆر پێویستە کە لاوانی توندڕەوی ئێمە، لەجیاتی بەفیڕۆبردنی کاتی خۆیان بۆ گاڵتەی روناکبیرانە، تێبگەن کە سەرەڕای کاری دژوار ئێمە، لە هەنگاریا جۆرێك ئاسایش هەیە کە لە عەیش و عشرەت بەدوورە. باشترە ئەوە بزانن کە وڵاتی ئێمە ماوەیەکی زۆر نیە کە سەردەمی خۆنەویستی تێپەڕاندووە و گەڕانەوە بۆ دواوە، سامناکە. ئەوان نابێ شۆڕش لە ئاسایش جیابکەنەوە: ئەم دوانە لە پەنای سۆسیالیزمدا یەکتر رەت ناکەنەوە. دەبێ لە ئاکارێ خۆیان دوور بگرن کە بانگەوازی شۆڕش دەکا، بەڵام بە نادیدەگرتنی راستیەکان تەنیا بە کارەسات دەگات.

# وڵامی میکولوش هاراستی
# بۆ
# رافیش هایدۆ

من لەوپەڕی حەپەساندا، لە نێو وتارەکەی رافیش هایدۆ خۆم دیتـەوە. بۆیە دەڵێم خۆم دیتەوە، چونکە لـە وتارەکـەی ئـەودا تەنانـەت نـاوی مـن نـەهاتووە و تـەنیا دەوتـرێ کـە باسـی شـیعری مـن (هەڵـەکانی چـەگوارا) دەکات کە لە ژمارەی دێسامبری Uj Irasدا چاپکراوە.

من پێم خۆشە لەمەڕ شیعرەکەم، لەمەڕ نـاوەرۆکی ئـەو و هـەموو ئـەو بابەتانـەی کـە رافـیش هایـدۆ لـە وتارەکەیـدا باسـی کـردووە، بـە درێـژی قسەبکەم. بەڵام نامەوێ لەمەڕ مافی ئازادی بەیان قسەبکەم. ئەو پێی وایە کە من لە شێعرەکەمدا باسی ئەو ناو و ناتۆرانەم کردووە کە خراونەتە پـاڵ چەگوارا، بەڵام نامەوێ لە خۆم بپرسم کە ئایا رافـیش هایـدۆ لـە وتـەکانی دیکەیدا راست دەکا یان نا.

چـونکە ئەگـەر کەسـێ لـە بوارێکـدا پسـپۆڕ نـەبێت، دەبـێ لـە هـەموو بوارەکاندا هەروا بێت. ئەگەر هـەموان لـە هـەموو بوارێکـدا پسـپۆڕ بووبـان چـی دەبـوو؟ ئایـا رافـیش هایـدۆ شایسـتـەیی ئـەوەی هەیـە کـە لەسـەر مارکسیست بوونی خەڵکیتر داوەری بکات؟ کێشەکە ئەمەیە: ئایا چـەگوارا مارکسیسـتە؟ "ئێمـە" تونـدڕەوەکان، چـەپە رادیکاڵـەکان، ئـەوجۆرە کـە رافیش هایدۆ ناومان دەبات — بە مارکسیسزمی سادەی خۆمانـەوە پێمـان وایـە کـە ئـەو مارکسیسـت بـووە. یـان لانیکـەم ئـەو بـە شۆڕشـگێڕێکی رۆشنبینی سەردەمی خۆمان دەزانین...

نابێ لە کەسێك داوای رەفتاری مارکسیستی بکەین، مەگەر ئەوە کە ئەو بە مارکسیست بزانین. بۆیە ئاماژە بەم خاڵە دەکەم چونکە رافیش هایدۆ بە پارێزەوە لە پرسی سەرەکی هەڵدێت: ئایا چەگوارا بە مارکسیست دەزانێت؟

شیعری من چەندین رەوت و بزاڤی فرەچەشنی بۆ زیندوو دەکاتەوە. ئەو لەئاست ئەم رەوتانە، بەشێوەی دوگم و سکتاریستی راوەستاو تووشی سەرسورمانی کردین.

ئەڵبەت لە بزاڤە خوێندکارییەکاندا و بەگشتی لە رەوتە شۆڕشگێڕانە رەسەنەکاندا، زۆر توخمی ناکۆك هەن، بەڵام ئێمە چونکە مارکسیستین ناتوانین هاوسۆزی خۆمان لەگەڵ ئەم بزاڤانە دەرنەبڕین.

ئێمە ناتوانین بە نیوە دێڕێك کە جێگایەك بۆ ناکۆکی نەهێڵێتەوە، خۆمان لە رژی دۆبرەی شۆڕشگێڕ جیابکەینەوە. ئەو چوارەمین ساڵی زیندانی خۆی تێپەڕدەکا و من زۆرم پێخۆشە کە لەگەڵی دیالۆگ بکەم (ئەریێ لەگەڵ ئەو) چونکە ئەمە بەو مانایەیە کە ئەو دوبارە ئازاد بووە. کاتێ رافیش هایدۆ ئیتر بزاڤێکی سیاسی نیە هەتا رێکی بخات، بە داهێنانی چەندین دەستەواژەی لەمجۆرە خۆی دڵخۆش دەکات: "خۆنەویستی شۆڕشگێڕانە" و "دیموکراسی بێسنوور". من دڵنیام کە ئەم چەمکانە تەنیا هی خودی رافیشن و بەس.

مەبەستی من ئەوە نیە کە ئێمە خوازیاری دیموکراسییەکی کراوەتر لە وەی کە لە وتارەکەی ئەودا هاتووە، نین و خۆنەویستی شۆڕشگێڕانەی پێویست لە هەندێ دۆخی مێژووییدا پروتستۆ دەکەین. بەڵام ئەوەی هایدۆ لەم چەمکانە هەڵیدەهێنجێ (دیموکراسی بێسنوور: رەتکردنەوەی خەسڵەتی چینایەتی دیموکراسی، خۆنەویستی شۆڕشگێڕانە: دژایەتی لەگەڵ ئاسایش و بەختەوەری چینی کرێکار) لە شیعرەکەی مندا نیە و لەگەڵ ئەندێشەی مندا نایەتەوە.

رافیش هایدۆ هەموو ئەم شتانە دەڵێ بێئەوەی کە تەنانەت دێڕێك لە شیعرەکەی من بە بەڵگە بێنێتەوە. ئەو ئەم شیعرە "دەنرخێنێ"، بەڵام هیچ دێڕو هیچ بڕگە و هیچ ئەندێشەیەکی بە بەڵگە ناهێنێتەوە.

جێگیرکردنی دەستەواژەی سیاسی لەجیاتی توێژینەوەی "جوانیناسانەی کۆنکرێت"[19] هەر ئەو شتەیە کە ئیگنوتوشی[169] نووسەر، کە ناکرێ بە مارکسیستی بزانین، لە سەرەتای ئەم چەرخەدا بە "جوانیناسی ئەشکەنجە" ناودێری کردووە، مێتۆدێك کە ئەدەبیاتی پێشڕەوی هەنگاریا بەردەوام لەگەڵ ئەو خەباتی کردووە. هەر ئەم مێتۆدی کۆنی "رەخنە"ی داڕزیو و دژەئەدەبەیە کە منی بۆ نووسینی ئەم وڵامە هانداوە.

19 Esthetique concrete.

169 Ignotus، نووسەری هەنگاری (1869–1949)، رەخنەگری رۆشنبین و وردبین، خاوەن ستایلێکی ئێجگار تایبەت، قارەمانی لیبرالیزم و رەوتە مۆدێرنەکان لە سیاسەت و ئەدەبیاتدا. بە چالاکی و بە نووسراوەکانی لە دژی دزێوییەکانی جەنگ ئاخێز دەکا، و لە ژیانی ئەدەبی هەنگاریادا رۆڵی پلە یەك دەگێڕێ– و.

# فەرهەنگی کۆن و فەرهەنگی نوێ

## جۆرج لوکاچ

1

گەشەی کۆمەڵگا پرۆسەیەکی یەکە و یەکپارچەیە، یانی هیچ قوناغێکی تایبەت لە گەشەی کۆمەڵگا بەئەنجام ناگات مەگەر ئەوە کە لەسەر هەموو هەرێمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کاریگەر بێت. بەهۆی ئەم گونجاوی و یەکانگیرییەی گەشەی کۆمەڵایەتی ئەم دەرفەتە دەرەخسێ کە پرۆسەیەکی یەکسان لە روانگەی ئەم یان ئەو دیاردەی کۆمەڵایەتیەوە دەرك بکەین و زانیاریەك لەو بەدەس بێنین. بەمبۆنەوەیە کە دەتوانین باسی فەرهەنگ بەجیا لە دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی تر بکەین، چونکە ئەگەر فەرهەنگی هەر قوناغێك بەباشی دەرك بکەین هاوکات لەگەڵ ئەو سەرچاوەی گەشەی گشتی ئەو قوناغەش دەرك دەکەین، هەر بەوجۆرە کە لە کاتی شرۆڤەی مناسباتی ئابووریشدا وادەکەین.

بورژوازی بە شیوەن و گریانەوە بۆ روخانی نەزمی سەرمایەداری زۆرجار بانگەشەی ئەوە دەکات کە نگەرانیی واقعی ئەو لەپێناو گەندەڵ بوون و داڕزینی فەرهەنگ دایە و داکۆکی لە بەرژەوەندی چینایەتی خۆی بەجۆرێك ئاراستە دەکات کە گۆیا بناغەی ئەم بەرژەوەندییە بەها هەتاهەتاییەکانی فەرهەنگ پێکدێنێ. بەپێچەوانەوە، سەرەتای تێکڕای ئەو بیرو رایە کە لەم وتارەدا ئاراستەی دەکەین ئەم روانگەیە کە فەرهەنگی چاخی بورژوازی لەخۆیدا و لەپاش لێکترازانی ئابووری خەریکە

دەپووکێتەوە. کەوابوو بەپێچەوانەی نگەرانیەکانی بورژوازی، پێویستی حەتمی وادەخوازی کە لەپێناو بەرژەوەندی فەرهەنگ، لەپێناو کردنەوەی رێگایەك بەرەو فەرهەنگی نوێ، پرۆسەی درێژخایەنی مەرگی کۆمەڵگەی بورژوازی بە کۆتایی بگات.

ئەگەر فەرهەنگی دوو سەردەم لە روانگەیەکی زانستییەوە سەیری بکرێ پرسی سەرەکی ئەمەیە: دۆخی ئابووری و کۆمەڵناسانەی بوون و مانەوەی فەرهەنگ کامەیە؟ وڵامێك کە سەرئەنجام دەبێ لەوەوە دەس پێبکەین لە پێوەندی نێوان فەرهەنگ و پێشمەرجە کۆمەڵایەتیەکانی ئەو بەدەست دێت. بەڵام بەڕاستی فەرهەنگ چیە؟ چەمکی فەرهەنگ (لەئاست چەمکی شارستانیەتدا) لە یەك وتەدا بریتیە لە تێکڕایی بەرهەم و وزەو توانایە بایەخدارەکان کە لەپێناو پاراستن و دابینکردنی خێرایی ژیاندا پێویست نیە. بۆ نموونە جوانی دەروونی و دەرەکی خانوویەك لەئاست رەهەندی پایەداری و سەقامگیری و لایەنی ئەمنی و ئاسایشی ئەو بە فەرهەنگ دەژمێردرێت. کەوابوو کاتێ دەپرسین: دەرفەتی کۆمەڵایەتی فەرهەنگ لەچی دایە؟ دەبێ بڵێین: فەرهەنگ لە خزمەت کۆمەڵگەیەك دایە کە لەودا دابینکردنی نیاز و پیویستییە سەرەتاییەکان رەنگە بەشێوەیەك بێت کە بۆ دابینکردنی ئەم پێویستییانە ناچار نەبێت دەستەویەخەی کار و تێکۆشانێکی تاقەت پروکێن بێت کە هەموو وزە و توانای ئەو لەنێو ببات، بە وتەیەکیتر فەرهەنگ لە جێگایەکدا دەردەکەوێ کە وزە و توانای ئازادانە لە خزمەت فەرهەنگدا بێت.
لێرە دایە کە فەرهەنگی کۆن هەر هەمان فەرهەنگی چینی دەسەڵاتدارە، چونکە تەنیا چینە دەسەڵاتدارەکان لە بارودۆخێکدا بوون کە توانیویانە هەموو توانایە بەهادارەکانی خۆیان بەدەر لە نگەرانی و خەمی نان و

ژیان بخەنە خزمەت فەرهەنگ. لێرەشدا وەك هەر شوێنێكیتر سەرمایەداری تێكـڕای نـەزمی كۆمەڵایـەتی ژێـراوژوور كـرد و هـەموو ئیمتیازەكـانی فیۆداڵەكان و لەهەمان حاڵدا ئیمتیازە فەرهەنگیەكانی كۆمـەڵگای فێـوداڵی سڕییەوە. بەتایبەت سەرمایەداری چینی دەسەڵاتدار یانی بورژوازی بەرەو خزمەتكردن بە بەرهەمهێنان پاڵپێوەنا.[170] تایبەتمەنـدی شـازی بـورژوازی لەئاست سیستمەكانی پێشوو ئەوەیە كە لـە سـەرمایەداریدا خـودی چـینی چەوسـێنەر لـەنێو پرۆسـەی بەرهەمهێنانـدا یەخسـیر دەبێـت و چـینی زاڵ ناچار دەبێت كە وزە و توانـایی خـۆی لـەپێناو خـەبات بـۆ بەدەسـتهێنانی سـوودی زیـاتر سـەرف بكـات، رێـك هـەر بـەوجۆرەی كـە چـینی كرێكـار ناچاردەبێت كە هەوڵ و توانایی خۆی لەپێناو نان سەرف بكات.

(بۆ نموونە مـدیری كارخانـەی سـەردەمی سـەرمایەداری لەگـەڵ ئاغـای سەردەمی سێرف[171] بەراورد بكەن). وادیارە ئـەم نمونەیـە لەگـەڵ زۆربـەی ئـەو مفـت خـۆرە تەوەزلانـەی كـە چـینی بـورژوا پـەروەردەیان دەكـا و داكۆكیان لێـدەكات لـە نـاكۆكی دایـە. سـەرەڕای ئەمـەش نابـێ رواڵـەت و نیشـانەكان گەوهـەر و نـاوەرۆكی كێشـەكەمان لێ ون بكـات چـونكە كاتـێ باسـی فەرهـەنگ لـەئارا دایـە تـەنیا دەبـێ باشـترین هێزەكـانی چـینی دەسەڵاتدارمان مەبەست بێت. لە سەردەمانی پێش بورژوازیدا ئـەم هێزانـە لـەنێو مناسـباتێكدا جـێگیر دەبـوون كـە دەیـانتوانی وزە و تواناییـەكانی خۆیان بۆ گەشەی فەرهەنگ تەرخان بكەن، بەڵام بـورژوازی بەپێچـەوانەوە

[170] -Engels, Zur wohnungsfrage, p. 17.
[171] -Sefrdom.

ئەم هێزانەی وەك كۆیلەی بەرهەمهێنان لێكردووە، رێك هەر بەوجۆرەی كە كرێكارانی تووش كردووە (هەرچەند كە لەرووی مادییەوە كویلەتی ئەوان لەگەڵ كویلەتی كرێكاران بەتەواوی جیاوازە).

رزگابوون لە بورژوازی بەمانای رزگاری لە دەسەڵاتی ئابوورییە. شارستانیەت دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا فەراهەم دەكات بەڵام لە درێژەی ئەم پرۆسەدا خودی مرۆڤیش دەچێتە ژێر دەسەڵاتی هەمان ئامێرەوە كە سروشتی دەستەمۆ كردووە. بورژوازی تەشقی ئەم دەسەڵاتەیە. لە بورژوازیدا هیچ چینێك نیە كە بەهۆی جێگای خۆی لە سیستمی بەرهەمهێناندا بۆ پێكهێنانی فەرهەنگ بانگ بكرێت. روخاندنی سەرمایەداری، یانی رسكانی كۆمەڵگەی سۆسیالیستی، رێك ئەم رەهەندانەی پرسەكە دەگرێتەوە. سۆسیالیزم دامەزراندنی نەزمێك دەكاتە ئامانجی خۆی كە لەودا هەركەسێك دەتوانێ بە مێتۆدێك بژی كە لە سەردەمانی پێش بورژوازیدا تەنیا بو چینی زاڵ فەراهەم بووو، و لە بورژوازیدا بۆ چینی زاڵی هەنووكە هەموار كراوە.

لەم خاڵە دایە كە مێژوویی مرۆڤایەتی بەراستی دەس پێدەكات، هەر بەوجۆرەی كە مێژوو بەمانای كۆنی وشەكە بە شارستانیەت دەستی پێكرد و خەباتی مرۆڤ لەگەڵ سروشت لە سەردەمی "پێش مێژوو"وە دەستی پێكرد، هەر بەمجۆرەش نووسینی مێژووی سەردەمی داهاتوو، مێژووی واقعی مرۆڤایەتی، بە سۆسیالیزمی گەشەكردوو دەس پێدەكات. لەو كاتەدا دەسەڵاتی شارستانیەت وەك دوهەمین قۆناغی پێش مێژوو حساب دەكرێت.

2

کەوابوو حەتمیترین تایبەتمەندی کۆمەڵگای سەرمایەداری ئەمەیە کە ئیتر ژیانی ئابووری ئامێرێك بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی نیە بەڵکوو لە ناوەندی هەموو شتێکدا جێگیر دەبێ و لەخۆیدا وەك ئامانج و مەبەستی هەموو چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان دەردەکەوێ. یەکەمین و گرنگترین بەرئەنجامی ئەم کارە ئەوەیە کە ژیانی کۆمەڵگا وەك جۆرێك پێوەندی سەوداگەری لێدێ و خودی کۆمەڵگاش وەك بازاڕێکی گەورە دەردەکەوێ. لە ئەزموونەکانی ژیانی تاکیدا ئەم دۆخە خۆی لە فۆرمی کاڵادا دەردەخات، فۆرمێك کە هەموو بەرهەمەکانی چاخی سەرمایەداری و هەروەها هەموو تواناکانی بەرهەمهێنەران و خولقێنەران وەك پەردەیەك دەگرێتەوە. ئیتر هیچ شتی لەخۆیدا یان بەهۆی بەهای دەروونی خۆیەوە (بۆ نموونە بەهای هونەری و ئەخلاقی) بایەخدار نیە. هەر شتێك تەنیا بەو هۆیە بایەخی هەیە کە لە بازاڕدا دەکەوێتەبەر کڕین و فرۆشتنەوە. پێویست بە هیچ شرۆڤەیەکی قووڵ ناکات تا پیشان بدەین کە ئەم کارە تا چ رادەیەك بۆ هەموو فەرهەنگەکان رۆخێنەرە. راست هەر بەوجۆرەی کە ئەگەر مرۆڤ خەم و نگەرانی نان و ژیانی نەبێت، زەمینە و دەرەتانی تێکۆشانی فەرهەنگی دەرەخسێت، راست هەر ئەو کاتەش هەموو ئەو شتانە کە فەرهەنگ پێکدێنن تەنیا ئەو کاتە دەتوانن بایەخی فەرهەنگی واقیعییان هەبێت کە لەخۆیاندا بایەخدار بن. ئەو ساتەی کە بەرهەمە فەرهەنگییەکان وەك کاڵا دەردەکەون، ئەو کاتەی کە ئەم بەرهەمانە لەنێو پێوەندییەکدا جێگیر دەبن کە دەیانکاتە کاڵا، ئازادی ئەم بەرهەمانە– یانی دەرفەتی فەرهەنگ – لە بزاڤ دەکەوێ.

سەرمایەداری لە شوێنێکی دیکەشدا بەشێوەی بنەرەتی هێرشی کردۆتەسەر دەرفەتە کۆمەڵایەتیەکانی فەرهەنگ، ئەوەش پێوەندی سەرمایەدارییە لەگەڵ بەرهەمهێنانی بەرهەمە فەرهەنگیەکاندا. دیمان کە لە روانگەی بەرهەمەوە تا بەرهەم ئامانجی خۆی لەناخی خۆیدا هەڵنەگرێت

دەرفەتی دەرکەوتنی فەرهەنگ نارەخسێت. ئێستە دەبێ بڵێین کە لە روانگەی پێوەندی بەرهەم و خولقێنەری بەرهەمەوە فەرهەنگ تەنیا کاتێ هەموار دەبێ کە بەرهەمهێنان پرۆسەیەکی یەکپارچە و سەربەخۆ[172] بێت، پرۆسەیەك کە هەلومەرجی ئەو بە دەرفەت و توانایيە ئینسانیەکانی بەرهەمهێنەرەوە بەستراوە. بەرجەستەترین نمونەی وەها پرۆسەیەك بەرهەمێکی هونەرییە کە لەودا گەشەی گشتی بەرهەم تەنیا کاری هونەرمەندە و هەر توخمێك لە بەرهەم بە خەسڵەت و تایبەتمەندی تاکی هونەرمەندەوە بەستراوە. لە سەردەمی پێش بورژوازیدا ئەم رۆحەی هونەر لەسەر هەموو سەنعەت و پیشەسازی زاڵ بوو و لانیکەم بە سەرنجدان بە تایبەتمەندی ئینسانی ئەم پرۆسەیە، چاپی کتێبێك لە نووسینی ئەو جیانەبوو، بەڵام بەرهەمهێنانی بورژوازی نە تەنیا ملّکداری ئامێرەکانی بەرهەمهێنان لە کرێکاران دەستێنێتەوە، بەڵکوو لە ئەنجامی دابەشبوونی کار و رەوتی گەشەی پسپۆرانەبوونەوەی کار و پیشەکاندا بەرهەم بەجۆرێك لەت لەت و دابەش دەکات کە هیچ لەتێك لەخۆیدا مانادار و خودموختار نیە. کاری هیچ کرێکارێك لەگەڵ بەرهەمی بەرهەمهاتوو پێوەندی راستەوخۆی نیە، بەرهەم تەنیا بۆ مەزندەی ئابستراکتی سەرمایەداران، یانی تەنیا وەك کاڵا مانای هەیە.

گەشەی بەرهەمهێنانی ماشێنی رەهەندی نامرۆڤانە و دژەئینسانی ئەم پێوەندییە توندوتیژتر دەکات. دابەشبوونی کار کە لە بەرهەمهێنانی کارگەییەوە دەستی پێکرد و چۆنیەتی یەکە یەکەی لەتەکان بە توانایی رۆحی و جەستەیی کرێکارەوە بەسترابوو، و هەر بە یارمەتی ئەم تواناییە شکڵی دەگرت، لە کاتێکدا کە لە سەنعەتی ماشێنی پێشکەوتوودا هەرچەشنە پێوەندیەك لەنێوان بەرهەم و بەرهەمهێنەردا لەنێو چووە.

[172] Self-contained.

بەرهەمهێنان بەتەواوی بە ماشێنەوە بەستراوە، مرۆڤ دەبێتە خزمەتگوزاری ماشێن و خۆی لەگەڵ ئەو رێك دەخات، بەرهەمهێنان بەگشتی لە دەرفەت و تواناییەکانی کرێکار جیادەبێتەوە و سەربەخۆ دەبێت.[173]

لە کەنار هێزە فەرهەنگ رۆخینەکاندا... چەن هێزێکی هاوشێوەی دیکە لە سیستمی سەرمایەداریدا کاریگەرن کە ئەگەر پێوەندی بەرهەمەکان پێکەوە دەرك بکەین، گرنگترینی ئەم هێزانەش دەبینین. لە سەردەمانی پێش بورژوازیدا دەرفەتی گەشەی فەرهەنگ فەراهەم بوو چونکە بەرهەمە فەرهەنگییە جیاوازەکان لەگەڵ یەکتر پێوەندی بەردەوامیان هەبوو – بەرهەمێك ئەو پرسانەی پێش دەخست کە بەرهەمی پێش خۆی گەڵاڵەی کردبوو، بەمبۆنەوە تێکڕای فەرهەنگ لێکبەستران و بەردەوامیەکی تایبەتی لە گەشەی شێنەیی و ئورگانیك ئاشکرا دەکرد. کەوابوو دەرفەتی ئەم کارە هەبوو کە لە هەر چاخێکدا فەرهەنگێکی تۆکمە، سادە و رەسەن سەرهەڵبدات، فەرهەنگێك کە ئاستی ئەو لە ئاستی بەرزترین دەسکەوتەکانی وزە و توانا ئیزولە و تاکییەکان سەرتر دەچوو. بورژوازی بە گۆڕینی پرۆسەی بەرهەمهێنان لە رێگەی ئاشووب و

---

[173] زۆر کەس ئەم پرۆسەیە لە پێکهاتەی دابەشبوونی کاری فەنی سەنعەتی مکانیزەدا جێگیردەکەن و پرسەکە وا گەڵاڵە دەکەن کە گۆیا وەها دۆخێك دەبێ لەپاش روخانی بورژوازیش درێژە بە ژیانی خۆی بدات... مارکس لە روانگەیەکی جیاوازەوە سەیری ئەم پرسەی دەکرد و پێی وابوو کە: "کارکردی کاری نیۆ کارخانە و دابەشبوونی کاری نێو کۆمەڵگە" لەگەڵ یەکتر پێوەندی بەراوەژوویان هەیە، یانی لە کۆمەڵگەدا هەرکات یەکێ لەم دووانە گەشە دەکات ئەوی تر پاشەکشە دەکات ...

Karl Marx, Elend der philosophie, D. 120.

بێنەزمی بەرهەمهێنانەوە رەهەندە بەردەوام و ئورگانیکەکانی فەرهەنگی کۆنی لێکپچڕاند. بۆ فەرهەنگ، گۆرینی بەرهەمهێنان لەلایەکەوە بەمانای ئەوەیە کە پرۆسەی بەرهەمهێنان بەردەوام ئەو هۆکارانە دێنێتە ئاراوە کە بە خەستی لەسەر فەن و رەوتی بەرهەمهێنان کاریگەرییان دەبێت بێ ئەوەی کە لەگەڵ گەوهەری بەرهەم ... پێوەندییان هەبێت. لەلایەکی ترەوە... توخمە تازە و پرشەوق و بەرچاوەکان سەرەرای ئەوەی کە بەهای دەروونی و هەقیقی بەرهەم کەم یان زیاد دەکەن گرنگی پەیدا دەکەن. رەنگدانەوەی فەرهەنگی ئەم پرۆسەی شۆڕشگێرانەیە دیاردەیەکە کە بە"مۆد" ناوبانگی دەرکردووە، دیاردەیەك کە ئاماژە بە چەمکێك دەکات کە لە بنەڕەتدا لەگەڵ چەکی فەرهەنگ جیاوازی هەیە. مەبەست لە مۆد ئەمەیە کە فۆرم و چۆنیەتی بەرهەمێك کە دەڕواتە بازاڕ لە ماوەی زەمەنێکی کورتدا دەگۆڕدرێت، ئەم کارەش سەربەخۆ لە جوانی یان مەبەستی ئەم گۆڕانە بەئەنجام دەگات. ئەمە خەسڵەتی بازاڕە کە شتە تازەکان دەبێ لە چەن قۆناغێکی تایبەتدا بەرهەم بهێنرین، یانی ئەو شتانەی کە لە بنەڕەتدا لەگەڵ شتەکانی پێشوو جیاوازییان هەبێ و بەپێی ئەزموونەکانی پێشوو پێکنەهاتبن، چ بەهۆی خێرایی گەشەی بەرهەمهێنانەوە نەکرێت ئەم ئەزموونانە دەرك و گەڵاڵەو هەرەس بکرێت، چە بەهۆی سروشتی مۆدەوە هیچ کەس نەیەوێت کاری خۆی بەپێی ئەوانە رێکبخات، لەهەر حاڵدا ئەم کارە پێویستی بە لادانی تەواو لە فۆرمەکانی پێشوو هەیە. لێرە دایە کە هەر چەشنە گەشەیەکی ئورگانیك لەنێودەچێ و لەجیاتی ئەو جۆرێك شێت مەزاجی بێئامانج و مۆدگەرایی بۆش و پرهەرا جێگیردەبێت.

## 3

بەڵام ریشەکانی قەیرانی فەرهەنگی بورژوازی لەوەش قووڵترە. بناغەی قەیرانی بەردەوام و روخانی ناوەکی بورژوازی لەمە دایە کە ئایدیۆلۆژی لەلایەك و بەرهەمهێنان و نەزمی کۆمەڵایەتی لەلایەکیترەوە لەگەڵ یەکتردا تووشی ناکۆکیەکی بێچارەسەر دەبن. چینی بورژوا سەرەڕای خەبات لەپێناو دەسەڵات ئەو کاتەی کە بۆ یەکەمجار بەدەسەڵات گەیشت لە ئەنجامی پێویستی ئاشووبی بەرهەمهێنانی بورژوازیدا تەنیا دەیتوانی ئایدیۆلۆژییەکی هەبێت ئەوەش ئازادی تاکی بوو. بێگومان قەیرانی فەرهەنگی بورژوازی ئەوساتە دەستی پێکرد کە ئەم ئایدیۆلۆژییە لەگەڵ نەزمی کۆمەڵایەتی بورژوازی تووشی ناکۆکی هات. مادام کە چینی بورژوای پێشرەو – بۆ نموونە لە سەدەی هەژدەهەمدا – ئەم ئایدیۆلۆژییەی لە دژی خەفەقان و ئاستەنگی کۆمەڵگەی فیۆداڵی بەکار برد، ئەم ئایدیۆلۆژییە بەیانی روشنی دۆخێکی تایبەت لە خەباتی چینایەتیدا بوو. کەوابوو بورژوازی بەراستی لەم سەردەمەدا دەیتوانی فەرهەنگێکی رەسەنی هەبێت. بەڵام کاتێ بورژوازی بەدەسەڵات گەیشت (ئەم دەسەڵاتە بە شۆڕشی فەرانسا دەستی پێکرد) ئیتر نەیدەتوانی بەشێوەی شێلگیر ئایدیۆلۆژی خۆی زیندوو و گەشەدار رابگرێت، ئیتر نەیدەتوانی ئەندێشەی ئازادی تاکی لەمەڕ هەموو کومەڵگا بەکار ببات مەگەر ئەوە کە نکۆڵی لە خۆی[174] یانی ئەو نەزمە کۆمەڵایەتیە بکات کە لە پلەی یەکەمدا خودی ئەم ئایدیۆلۆژییەی خولقاندبوو. بەکورتی بۆ چینی بورژوا ئیمکانی نەبوو کە ئەندێشەی ئازادی خوازی خۆی لەمەڕ چینی کرێکار بەکارببات. دوالیزم یان ناکۆکی بێچارەسەری ئەم دۆخە بەمجۆرەیە: بورژوازی یان دەبێ ئەم ئایدیۆلۆژییە رەتبکاتەوە یان دەبێ ئەو وەك دەمامکێ بۆ شاردنەوەی ئەو پرسانە بەکار ببات کە لەگەڵ ئەو

---

[174] Self-negation.

لە دژایەتی دان. لە دۆخی یەکەمدا جۆرێك ئاشووب و بێئارمانی ئەخلاقی دروست دەبێت چونکە بورژوازی بەپێی پێگەیەك کە لە سیستمی بەرهەمهێناندا هەیەتی ناتوانێ بێجگە لە ئایدیۆلۆژی ئازادی تاکی ئایدیۆلۆژییەکی تر بخولقێنێ. لە دۆخی دووهەمدا لەگەڵ قەیرانی ئەخلاقی ناوخۆییدا بەرەوڕوویە: چونکە ناچارە لە دژی ئایدیۆلۆژی خۆی هەڵوێست بگرێت.

ئەم قەیرانە کاتی قووڵتر دەبێت کە خودی بنەمای ئازادی بە ناکۆکی بێچارەسەر دەگات. ئەڵبەت لێرەدا ناتوانین قۆناغی بورژوازی ماڵی شرۆڤە بکەین. تەنیا دەبێ ئەم راستیەمان وەبیربێتیەوە کە "رێخستنی" بەرفراوانی بەرهەمهێنان کە لەم قوناغەی بورژوازی (کارتل و تراستەکان)دا سەرهەڵدەدات لەگەڵ ئەندێشەی زاڵی بورژوازی سەرەتایی (پێشرەو) یانی رکەبەرایەتی ئازاد، ناکۆکی تەواوی هەیە. ئەم ئەندێشە لە درێژەی پرۆسەی کۆمەڵایەتیدا هەموو رەگ و ریشەی خۆی لە فاکتدا ئەدۆڕێنێت. هەر بەوجۆرەی کە توێژە باڵادەستەکانی بورژوازی بەپێی خەسڵەتی سەرمایەی ماڵی وەك هاوپەمانانی سروشتی دوژمنانی پێشووی خۆیان – چینی فیۆداڵ– دەردەکەون، هەر بەمجۆرەش ئەم توێژانەی بورژوازی لەنێو هاوپەیمانانی تازەی خۆیاندا بۆ ئایدیۆلۆژییەکی تازە دەگەڕێن. بەلام کۆشش بۆ سازگاری دووبارەی ئایدیۆلۆژی لەگەڵ سیستمی بەرهەمهێنان بەناچار تووشی شکەست دەبێت. چونکە بناغەی واقعی ئایدیۆلۆژییە کونسرڤاتیڤەکان – یانی فیۆدالیزم و سیستمی بەرهەمهێنانی هاوتەرازی ئەو – گۆڕینی بورژوایانەی بەرهەمهێنانی (کە لە سەردەمی سەرمایەی ماڵیدا بە تەشقی خۆی گەیشت) لێبڕاوانە روخاند. فیۆدالیزم

سەردەمێك فەرهەنگێکی هەبوو کە خاوەن بەها و دەسکەوتێکی گەورە بوو، بەڵام ئەم دەسەڵاتە فەرهەنگییە لە سەردەمێکدا روویدا کە کۆمەڵگەی فیۆداڵیی خاوەن زەمین باڵادەست بوو و تێکڕای کۆمەڵگا و بەرهەمهێنان بەپێی یاساکانی ئەو بەڕێوەدەچوو. بە سەرکەوتنی بورژوازی ئەم فۆرماسیۆنە کۆمەڵایەتیە لەنێوچوو و ئەم راستیە کە بەشی بنەڕەتی دەسەڵاتی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە دەست کەسانێکدا مایەوە کە سەردەمانێك زەمیندارانی دەسەڵاتدار بوون پێشی بە پرۆسەیەکی نەگرت کە ئەم زەمینانەی بەشێوەی سەرمایە دەرهێنا، یانی فۆرمی سەرمایەداری بەخۆوە گرت. بەرهەمی ئەم رەوتە بۆ فیۆداڵەکان هەر هەمان ناکۆکی نێوان ئایدیۆلۆژی و ئەو نەزمی بەرهەمهێنانە بوو کە هاوکات لەگەڵ بورژوازی سەریهەڵدا، هەرچەند کە فۆرمی سەرهەڵدان و بەیانی ئەم ناکۆکیە جیاواز بوو. بەمبۆنەوە کاتێ کە بورژوازی لە قۆناغی سەرمایەیماڵیدا بۆ ئاوی تازە و نوێکردنەوە دەگەڕا ئەو سەرچاوە خرۆشانەی بینییەوە کە خۆی بە زیخ و بەرد کوێری کردبۆوە.

لە روانگەی فەرهەنگدا دژایەتی نێوان ئایدیۆلۆژی و نەزمی بەرهەمهێنان ئەمەیە: بناغەی شکۆ و گەورەیی فەرهەنگە کۆنەکان (یۆنان، رێنسانس) لەسەر ئەم فاکتە راوەستاوە کە ئایدیۆلۆژی و نەزمی بەرهەمهێنان لەگەڵ یەکتر سازگار بوون. بەرهەمەکانی فەرهەنگ دەیانتوانی بەشێوەی ئۆرگانیك لە بەستێنی کۆمەڵایەتییەوە بڕسکێن و بپشکوێن. ئەگەریش گەورەترین بەرهەمە فەرهەنگییەکان تا رادەیەك لە دنیای دەروونی مرۆڤی ئاسایی بە دوور بوون دیسان لەنێوان ئەواندا تا

رادەیەك پێوەندی و لێكبەستران هەبوو. بەڵام فاكتی گرنگتر ئەمە بوو كە ئەمە سازگاری نێوان ئایدیۆلۆژی و نەزمی بەرهەمهێنان بوو كە سازگاری نێوان ئایدیۆلۆژی و شێوەی ژیانی ئەو سەردەمەی هەموار دەكرد... بەهەرحاڵ، لە هەر نەزمێكی كۆمەڵایەتیدا كاتێ كە شێوەی ژیان و ئاراستەی ئایدیۆلۆژیكی ئەو لەگەڵ یەكتر سازگاری سروشتی و ئاشكرایان هەبێت بۆ ئایدیۆلۆژی ئەم دەرفەتە دەڕەخسێ تا لە بەرهەمە فەرهەنگیەكاندا ئاراستەیەكی ئۆرگانیك بەخۆوە بگرێت. ئەم یەكپارچەییە ئۆرگانیكە تەنیا لە دۆخێكی تایبەتدا هەموار دەبێ، چونكە خودموختاری رێژەیی توخمە ئایدیۆلۆژیكەكان لە بناغەی ئابوورییان بەم مانایەیە كە ئەم توخمانە لە پلەی فۆرمەكاندا (یانی بەپێی بەهای فۆرمی و پرستیژی فۆرمیان) لەو فاكتانەی كە خۆیان پێكیان هێناوە، سەربەخۆن. بە وتەیەكیتر فۆرمەكانی بەیانی مرۆڤ سەربەخۆ لەو شتەیە كە نەزمی ئابووری و كۆمەڵایەتی زاڵی سەردەم ئاراستەی كردوون. ماتریالێك كە ئەم فۆرمانە شكڵی پێدەبەخشن بێجگە لە فاكتی كۆمەڵایەتی شتێكی تر نیە. بەمبۆنەوە كاتێ كە لەنێوان ئایدیۆلۆژی و نەزمی كۆمەڵایەتیدا دژوازییەكی بنەرەتی پێكدێت ئەم دژوازییە هەر بەوجۆرە دەردەكەوێ كە لە پرسی مەبەستدا گەڵاڵە بووە: فۆرم و ناوەرۆكی بەیانە فەرهەنگیەكان لەگەڵ یەكتر تووشی ناكۆكی دەبن. لێرەدا یەكپارچەیی ئۆرگانیكی بەرهەمە تاكیەكان بۆ ئەو كەسانەی كە لە ناخی فەرهەنگدا بەسەردەبەن ئاماژە بە یەكپارچەیی فەرهەنگی ئۆرگانیك ناكات.

بەمهۆیـە فەرهـەنگی سـەرمایەداری، ئەڵبـەت ئەگـەر بـە بـوونی وەهـا فەرهـەنگێ بروامـان هـەبێت، ناتوانـێ بێجگـە لـە نرخانـدنی بێرەحمانـەی سەردەمی سـەرمایەداری شـتێکی تـر بێـت. ئـەم رەخنەیـە جـار و بـار بـە ئاستێکی بەرز گەیشتووە (زولا، ئیبسـن) سـەرەڕای ئەمـەش بـە هـەر رادە راستگۆتر و بایەخدارتر بووە بەناچار سازگاری و جوانی سادە و سروشتی فەرهەنگی کۆنی زیاتر لەدەست داوە: مەبەست فەرهەنگ بەمانای رۆشن و هەقیقی وشەکەیە. ناکۆکی نێوان ئایدیۆلۆژی و مناسـباتی بەرهـەمهێنان، ناکۆکی نێوان فـۆرم و نـاوەرۆکی فەرهـەنگ لـە هـەموو بوارەکـانی بـەیانی ئینسـانیدا، لـە تێکـڕای قەڵـەمڕەوی ئـامێر و ماتریـاڵی فەرهەنگیـدا دەردەکـەوێت. بـەمجۆرە بـورژوازی بەناچـار لـەناخی خۆیـدا، لـە نـاخی ئایدیۆلۆژی ئـازادیی خۆیـدا، ئەندێشـەی مـرۆڤ وەك ئامـانجێکی گەوهـەریی دەخولقێنێ. بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە ئەم ئەندێشە بـەرزە هـەرگیز وەك دوا سـاڵەکانی قۆنـاغی پـێش بـورژوازی – قۆنـاغی ئایـدیالیزمی کلاسیکی ئاڵمان – وەها بەیانێکی رۆشـن و پـەتی و وشـیارانەی بـەخۆوە نەگرتبوو. سەرەڕای ئەمەش بێجگە لە بورژوازی هیچ نەزمیکی کۆمەڵایەتی ئەم ئەندێشەیە ئاوا بەگشتی و بەخەسـتی پێشـیل نـەکردووە. بـۆ نموونـە کاڵایی کردنی هەموو شـتەکان، تـەنیا لـە کـاڵاکردنی هـەموو بەرهەمەکانـدا بەرتەسك نـەبۆوە، بـەڵکوو هـەروەها مناسـباتی ئینسانیشـی گرتـەوە (بـۆ نموونـە ژنهێنـان وەبیربێننـەوە). لـەم پێکهاتەیـەدا، پێویسـتی دەروونـی رەوتـی ئایـدیۆلۆژی و فەرهـەنگ وادەخـوازێ کـە هـەموو بەرهەمـەکانی فەرهەنگی ئینسانی وەك ئامانجێکی گەوهەریی بـژمێردرێن. لەلایـەکیترەوە ماتریـاڵ – یـانی هـەمان شـت کـە بـە یارمـەتی فۆرمـە ئایدیۆلۆژیکـەکانی فەرهەنگ شـکڵ دەگـرێ – وەك رەتکردنـەوەی زینـدوو و لێبڕاوانـەی ئـەم فکرەیـە، ئەمەیـە کـە بـۆ وێنـە باشـترین نموونـەی شـێعری سـەرمایەداری ئیمکانی نیە تەنیا رەنگدانەوەی دەروونی خـۆی بێـت – بـەجۆرێك کـە بـۆ نموونـە جـوانی هەتاهـەتایی شـیعری یۆنـان راسـت لـەم رەنگدانـەوە و

مایرۆرینگـە[175] سروشـتییە نارەخنەگرانـەوە پێکهـات ــ بـەڵکوو تـەنیا نرخاندنی دۆخی سەردەمە.

4

هەنووکـە بـە مانـای ئـاڵوگۆڕی سۆسیالیسـتی کۆمـەڵگا لـە دیـدگای فەرهەنگەوە دەگەین. ئـەم رەوتـە بەتایبـەت بـەمانای کۆتـایی دەسـەڵاتی ئابوورییە بەسەر گشتێتی فەرهەنگدا. کەوابوو بـەمانای کۆتـایی پێوەنـدی تاقەت پروکێن و ناڵەباری مـرۆڤ و کـاری ئەویشـە، کارێـك کـە لـەودا مـرۆڤ پێـرەوی ئـامێری بەرهەمهێنانــە. نــەزمی کۆمەڵایــەتی سۆسیالیســتی سەرئەنجام بەمانای هەڵچون[176] لە ئـابووری وەك ئامـانجێکی گەوهەرییـە. بـەڵام لەبـەر ئـەوەی کـە پێکهاتـەی بـورژوازی لـە دنیـای زەینـی هـەموو ئەندامانیدا بەقووڵی رۆچووە، ئەم رەهەنـدە لـە ئـاڵوگۆڕ تـەنیا بەشـێوەی لاوەکـی دەرك دەکرێـت. ئـەم پرسـە راسـتیەکی رۆشـنە چـونکە ئـەم رەهەنـدەی ئـاڵوگۆڕ – یـانی هەڵچـوون لـە ئـابووری وەك ئامـانجێکی گەوهـەریی – ناتوانـێ خـۆی لـە نیشـانە رواڵەتییـەکانی ژیـانی پـاش بەدەستەوەگرتنی دەسـەڵاتدا بـەیان بکـات. زاڵبـوون بەسـەر ئابووریـدا – یـانی دامەزرانـدنی ئـابووری سۆسیالیسـتی – بـە مانـای سەرچـوون لـە باڵادەستی ئابوورییـە. ئـابووری کـە لەمـەو پـێش پرۆسـەیەکی باڵادەسـت بووە بە یاسای تایبـەت بەخۆیـەوە – ئـەقڵی مـرۆڤ ئـەوەی دەرك کـردووە

---

[175] mirroring.

[176] Aufhebung، چارەسـەرکردن، سەرچـوون، بەتایبـەت لـە زمـانی فەلسـەفی هێگلـدا بـە مانای سڕینەوەی لایەنە نگەتیڤەکانی شتێك و پاراستنی خاڵە پۆزەتیڤەکانی ئەو شتەیە.

بەڵام لە کونترۆڵی ئەودا نەبووە[177] ئێستا وەك بەشێك لە سیستەمی بەڕێوەبەری دەوڵەت، بەشێك لە پرۆسەی بەرنامەدار دەردەکەوێ و ئیتر لەژێر دەسەڵاتی یاسای تایبەت بەخۆیدا نامێنێتەوە. سەرەڕای هەموو ئەمانە دواین هێزی بزوێنەری ئەم پرۆسە کۆمەڵایەتیە یەکپارچەیە ئیتر ناتوانێ خەسڵەتیکی ئابووری هەبێت. ئەڵبەت وادیارە کە دیاردەکان لەگەڵ ئەم بانگەشەیە لە ناکۆکی دابێت، چونکە ڕۆشنە کە ڕێخستنی سەرلەنوێی بەرهەمهێنان هەم لەڕووی تیۆری و هەم لەڕووی کردارییەوە تەنیا لە بەستێنی ئابووریدا و بە یارمەتی دام و دەزگای ئابووری و بە یاری ئەندێشەی ئابووری پێکدێت. بێجگە لە مەش پێویست بە وتن ناکات کە بەپێی خەسڵەتی خەباتی چینایەتی لە قۆناغی دەسەڵاتداری چینی کرێکاردا – کە بە مانای بەرزترین قۆناغی خەباتی چینایەتییە – پرسەکانی خەباتی ئابووری و ڕێخستنی دووبارەی ئابووری لەو پرسانەن کە لە ریزی پێشەوەدا جێگیردەبن. سەرەڕای ئەمەش، ئەمە قەت بەو مانایە نیە کە بناغەی سەرەکی ئەم پرۆسەیەش خەسڵەتێکی ئابووری هەبێت، ئەو ئاڵوگۆڕە کارکردییە[178] کە دەسەڵاتی کرێکاری لە هەر

[177] ئەم دۆخە کاتی سەرهەڵدانی مەکتەبی "ئابووری سیاسی" لە شکڵی زانستێکی سەربەخۆدا دەردەکەوێ. بەر لە دەرکەوتنی ئابووری سیاسی زانستی ئابووری بە مانای ئەمڕۆیی وشەکە مەحاڵ بوو، کاتێ باڵادەستی ئابووری بە کۆتایی بگات، ئابووری سیاسیش وەك زانستێکی سەربەخۆ لەنێو دەچێت، هەر بەمبۆنەوەیە کە ڕوانین بۆ یاساکانی ئابووری سیاسی بە مانای یاسای هەمیشەیی و سروشتی لە ئایدیۆلۆژی پەتی بورژوازییەوە سەرچاوە دەگرێت.

[178] Functional.

هەرێمێکدا پێکی دێنێ لێرەشدا دەردەکەوێ. لە سەردەمی دەسەلاتی بورژوازیدا هەر رەهەند و تەوخمێکی[179] ئایدیۆلۆژیك تەنیا وەك "سەرخانی" پرۆسەیەکی ئابوورییە کە سەرئەنجام بە روخانی بورژوازی دەگات. بەلام لە حکومەتی کرێکاریدا ئەم پێوەندییە بەراوەژوو دەبێت. ئەلبەت مەبەستم ئەمە نیە کە رێخستنی سەرلەنوێی ئابووری تەنیا وەك "سەرخان" دەردەکەوێت (ئەم بۆچوونە یانی "سەرخان" تەنانەت لەمەڕ ئایدیۆلۆژیش ئەوەندە رۆشن نەبووە چونکە زۆر چەواشەکاری فکری لێکەوتۆتەوە)، بەلکوو مەبەستم تەنیا ئەمەیە کە سەربوونی ئابووری لەنێودەچێ. کەوابوو ئەگەر بە دیدێکی دیالکتیکی سەیری ئەم دۆخە بکەین ئەوەی بەڕوالەت لە دژی ئەم بانگەشەیە بە سوودی ئەو قسە دەکات.

لە قەیرانی کۆمەلگای بورژوازیدا فاکتەری ئایدیۆلۆژیك بەردەوام لە ریزی پێشەوەی وشیاری کۆمەلایەتیدا جێگیربووە. ئەم پرسە لەخۆڕا نیە بەلکوو ئاکامی پێویستییە، هێزە بزوێنەرەکان کە بەشێوەی بنەڕەتی رەوتی گەشەی کۆمەلگا دەبەنەپێش قەت ئیمکانی نیە بەتەواوی بە وشیاری جەماوەر دەرك بکرێن، چونکە خودی جەماوەر بەهۆی ئەم هێزانەوە ئاخێزیان کردووە. "رەخنە"ی سۆسیالیستی لەمەڕ ئەم قەیران و شۆڕشانە خەسلەتیکی رۆشنگەرانەی هەیە: ئامانجی ئەم رەخنەیە هێزە بزوێنەرە سەرەکیەکان – یانی پرۆسەی ئابووریی – ـە. کەوابوو هیچ شتێ لە مە سروشتی تر نیە کە دیدگایەك کە لەمەو پێش وەك دیدگای

[179] Moment.

رەخنەیی رۆڵی هەبووە بە روخانی بورژوازی هەروا رۆڵی پێشەنگ بگێرێت. خاڵی جێگای سەرنج لێرەدایە کە ئایا ئەم ئاڵوگۆڕە کارکردییە هەر ئەو شتەی رەت کردۆتەوە کە خۆی لە جێگەی ئەو دانیشتووە. تەنیا هێزە بزوێنەرەکانی بەرهەمهێنانی ئاڵۆز و لێکپچڕاو رەنگە وەك هێزە سروشتی و کوێرەکان دەوریان هەبێت. ئەم هێزانە تەنیا لە وەها دۆخێکدا دەتوانن دوابزوێنەرانی هەموو شتێك بن. هەر توخمێکی ئایدیۆلۆژیك یان خۆی لەگەڵ ئەم پرۆسەیە رێك دەخات (وەك پاژێکی سەرخانی لێدێت) یان بێهودە لەئاست ئەودا دژایەتی دەکات. لێرەدایە کە لە سیستمی بورژوازیدا هەر هۆکارێکی نائابووری تەنیا هۆکارێکی ئایدیۆلۆژیکە. تاقە بابەتی دەگمەنی رەخنەی سۆسیالیستی تێکڕای کۆمەڵگەی بورژوازییە، چونکە ئەم رەخنەیە پێویستی بە ئاوزەنگی پۆزەتیف یان نگەتیڤی پرۆسە ئیزولەکان نیە بەڵکوو دەمامك لەسەر روخساری گشتێتی لادەبات. ئەم رەخنەیە لە یەك کاتدا هەم دەمامك لەسەر روخساری گشتێتی پرۆسەی ئابووری لادەبات و هەم وەك کرداری کاریگەر لەپێناو گۆڕینی ئەودا رۆڵ دەگێڕێ. سەرەڕای ئەمەش ئەوەی تووشی گۆڕان دەبێت تەنیا ئاڵۆزی و لێکترازاوی ئابووری نیە بەڵکوو هاوکات باڵادەستی ژیانی ئابووری یانی ژیانی ژێر سێبەری سەروەری بزوێنەرە ئابوورییەکانیشە. کاتێ کە ژیانی ئابووری لەپێناو سۆسیالیزمدا رێك دەخرێت ئەو توخمانەی کە پێشتر لە باشترین حاڵەتدا رۆڵی ئامێر و ماتریاڵیان دەگێڕا ئێستا گرنگی پلە یەك پەیدا دەکەن: ئیتر بزوێنەرە ئابورییەکان لەسەر ژیانی دەروونی و بێروونی مرۆڤ زاڵ نیە بەڵکوو بزوێنەرە مرۆڤیەکان زاڵە.

هەر وەك دیمان جێگەی سەرسوڕمان نیە كە گۆڕینی ژیای ئابووری زۆر ڕاشكاوانەتر لە ریزی پێشەوەی وشیاری شۆرشگێرانەدا جێگیردەبێت نە ئەو توخمە ئایدیۆلوژیكەی كە سەرئەنجام ئەم وشیارییە لە ڕێگەی ئەوەوە وەگەڕ دەكەوێت. بەمجۆرە پرۆسەی ئالۆگۆری كاركردی تەنیا بە سەركەوتنی چینی كرێكار بە وشیاری ئەو دەگات. لە ڕاستیدا لەنێوان جەماوەری كرێكاراندا ئەم وشیاریە تەنیا بە مانای بەردەوامی خەباتی چینایەتی وشیارانەیە. پێشتر گەوهەری وشیاری چینایەتی بریتی بوو لە دەركی بەرژوەندی ئابووری لەلایەن چینێكەوە. تەنیا وشیاری هەمەلایەنە – كە سەرەڕای بەرژەوەندی ڕاستەوخۆ، لە ئەركی جیهانی ـ مێژوویی چینی كرێكار ئاگادارە – ئالۆگۆڕی كاركردی بۆ وشیاری چینی كرێكار دەگێڕێتەوە.[180]

ئەم ئالۆگۆڕە كاركردییە دەرفەتی فەرهەنگی نوێ دێنێتە ئاراوە، چونكە هەر بەوجۆرەی كە شارستانیەت بریتیە لە زاڵبوونی دەرەكی مرۆڤ بەسەر هەرێمی خوێدا، فەرهەنگیش بریتیە لە زالبوونی دەروونی مرۆڤ بەسەر هەرێمی خۆیدا. هەر بەوجۆرەی كە شارستانیەت ئامێرێك بۆ زاڵبوون لەئاست سروشت فەراهەم دەكات، فەرهەنگی پرۆلیتاریش ئامێرێك بۆ زاڵبوون لەئاست كۆمەڵگا فەراهەم دەكات. چونكە شارستانیەت و پێشكەوتووترین شكڵی ئەو یانی سەرمایەداری، كویلەتی مرۆڤی بەنسبەت ئابووری و بەرهەمهێنانی كۆمەڵایەتی بە تەشقی خۆی گەیاندووە. بەڵام

[180] بڕوانە بۆ وتاری وشیاری چینایەتی (Klassen bewusstsein)، "مێژوو و وشیاری چینایەتی" جۆرج لوكاچ.

پێشمەرجی كۆمەڵناسانەی فەرهەنگ گرنگیدان بە مرۆڤ وەك ئامانجێكی گەوهەرییە. ئەم پێشمەرجە كە لە كۆمەڵگای پێش بورژوازیدا لای چینە دەسەڵاتدارەكان هەبوو و بورژوازی لە هەموانی ستاندەوە، بە سەركەوتنی چینی كرێكار لە داهاتوودا دووبارە بۆ هەمووان پێكدێت. ئەم گۆڕینە بنەڕەتیەی تێكڕای پێكهاتەی كۆمەڵایەتی و هەموو دیاردەكان دەگرێتەوە، كە كاریگەری ویرانگەری فەرهەنگی ئەومان لە سەرەوەدا شرۆڤەكرد.

به ڕێخستنی ئابووری سۆسیالیستی ، خەسڵەتی شۆرشگێرانە لە بزاڤ دەوەستی و لەجیاتی بەردەوامی پرئانارشی (كە زادەی گومان و خەیاڵە) بەردەوامی ئورگانیك و گەشەی ڕەسەن جێگیردەبێت. هەر قۆناغێك هەڵگری ڕێگەچارەیەكە بۆ پرسە بێچارەسەرەكانی پێشوو، و لە هەمان حاڵدا بۆ قۆناغی داهاتووش پرسێكی تازە گەڵاڵە دەكات. ئاكامی فەرهەنگی حەتمی وەها گەشەیەكی ئورگانیك، گەشەیەك كە لە سروشت و گەوهەری شتەكانەوە سەرچاوە دەگرێ (نە لە گومان و خەیاڵەوە) ئەمەیە كە ڕەنگە ئاستی فەرهەنگ دووبارە لە ئاستی وزە و تواناییەكانی یەكە یەكەی تاكە ئیزولەكان سەرتر بچێت. پێوەندی لەگەڵ كاری ئەویدی و درێژە و بەردەوامی كاری ئەویدی – كە هەمان دووهەمین پێشمەرجی كۆمەڵناسانەی فەرهەنگ بێت– جارێكی تر هەموار دەبێت. جگە لە مەش هەم بەرهەمە فەرهەنگیەكان و هەم پێوەندییە ئینسانیەكان خەسڵەتی كاڵایی خۆیان ئەدۆڕێنن. سەرچوون لە مناسباتی كاڵایی، مرۆڤ و بەرهەمە فەرهەنگیەكان كە بە گشتی لەنێو مناسباتی ئابووریدا دەوریان بینیوە، بەهێز دەكات تا خەسڵەتی باڵادەستی خۆیان بەدەست بێننەوە. سەرەڕای ئەمەش دەرفەتی فەرهەنگ پێویستی بەوە هەیە كە بەردەوام رادەیەكی زیاتر لە فۆرمەكانی بەیانی مرۆڤی بەشێوەی قووڵتر و ڕۆشنتر بە سەربەخۆیی بگەن یان بە وتەیەكیتر بیانەوێت كە بە گەوهەری ئینسانی

مرۆڤ خزمەت بکەن. چونکە "ئامانجی گەوهەریی" فەرهەنگ و مرۆڤ تەنیا تایبەت بەم دووانە نیە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە هەر دوویان کاریگەری دولایەنەیان لەسەر یەکتر هەیە و یەکتر تۆکمە و پەرداخ دەکەن. ئەگەر بڵێین فلان بەرهەمی تایبەت، بۆ نموونە خانوویەك، یان ئامێرێکی نێوماڵە نە وەك کاڵایەك بەڵکوو بەجۆرێك بەرهەم دەهێنرێت کە رەهەندی جوانی و شیکی ئەو ئەوپەڕی رەزامەندی دەستەبەر بکات، وەك ئەوەیە کە بڵێین ئەو خانووە یان ئەو ئامێرە لە خزمەت "مرۆڤبوونی" مرۆڤ دایە و لە خواستەکانی مرۆڤ پێڕەوی دەکات. بەمجۆرە، بەرهەمە فەرهەنگیەکان ئیتر لە رێگەی پرۆسەی ئابووری کە سەربەخۆ لە مرۆڤ رۆڵ دەگێڕێ بەرهەم نایەن، پرۆسەیەك کە لەودا بەرهەمەکان چەند کاڵایەکی ئابستراکت و مرۆڤەکان تەنیا کڕیار و فرۆشیاری پەتین.

لە هەمان حاڵدا دەبێ پسپۆڕانە بوونەوەی بیمار ئاسای بورژوازی لە بزاڤ بوەستێ و بەرژەوەندی مرۆڤ لە بەرهەمهێناندا لەژێر دەسەڵاتی کار و کۆششی ئابستراکت و کڕین و فرۆشتنی بازاڕدا نەبێ بەڵکوو پێڕەوی پرۆسەی یەکپارچەی بەرهەمهێنان و بەهرەمەند بوون لە بەرهەمە باڵادەستەکان بێت – پرۆسەیەك کە گشتێتی مرۆڤ دەگرێتەوە — لەو کاتەدا پسپۆڕانە بوونەوەش تووشی ئاڵوگۆڕی کارکردی دەبێت. لە کۆمەڵگەی کرێکاریدا پسپۆڕێتی نە تەنیا خەسڵەتی چینایەتی بەڵکوو خەسڵەتی لەخۆناموکەری خۆی لەمەڕ چیەتی ژیانی مرۆڤ ئەدۆڕێنێ. بە سەرهەڵدانی بەرهەم وەك ئامانجێکی گەوهەریی ئەم بەرهەمە لەگەڵ گشتێتی و لەگەڵ دواپرسەکانی ژیانی مرۆڤیش سازگار دەبێت. بە سەرچوون لە ئیزولاسیون، دابڕان و تاکگەرایی پڕئاشووبی کۆمەڵگای مرۆڤی یەکەیەکی ئورگانیك پێکدێنی و پاژەکانی ئەم پێکهاتە – یەك

یەكی ئەندامان و بەرهەمەكان – لە خزمەتی ئامانجی هاوبەش یانی ئەندێشەی گەشەی مرۆڤدا زۆر زیاتر داكۆكی یەكتر دەكەن و رێزی یەكتر دەگرن.

5

بە گەڵاڵەكردنی ئەم ئامانجە هەنووكە بە كاكڵی پرسەكە دەگەین. ئەگەر ئامانجی كۆمەڵگەی نوێ تەنیا بریتی بێ لە گەشە و زیادبوونی رەزامەندی مرۆڤ و ئاسایشی ئەو، هیچكام لە ئاڵوگۆڕە كاركردییەكان بەم پانۆرامایە ناگەن، بە وتەیەكیتر مانایان ئەوەندە شیاوی سەرنج نابێت. لەم حاڵەتەدا رەنگە ئەركی دەوڵەتی كرێكاری لە رێخستنی بەرهەمهێنان و دابەشكردنیشدا بە ئەنجام گەیشتبێ. بەمجۆرە ژیانی ئابووری – ئەڵبەت بە چەندین ئامانجی تەواو جیاوازەوە – هەروا لەسەر بنەما ئینسانیەكان زاڵ دەبێت. لەم حاڵەتەدا گەشەی نوێ ئەڵبەت خێراتر و یەكلایەنەتر بە ئامانجەكانی دەگات و ئامانجەكان لەگەڵ رێخراوی بەرهەمهێنان و دابەشكردن دروستتر و رێك و پێكتر بە ئەنجام دەگات. سەرەڕای ئەمەش لەراستیدا دەوڵەتی كرێكاری بە گەیشتن بەم خاڵە تەنیا پێشمەرجە پێویستەكانی گەیشتن بە ئامانجەكانی خۆی پێكهێناوە و مرۆڤایەتی دەبێ بۆ چەسپاندنی ئەوان خەبات بكات.

رێخستنی سەرلەنوێی ئابووری لە دیاریكردنی دوا ئامانجەكاندا پێویستیەكی حەتمیە. ئەم پێویستیە تەنیا لە هۆكارە كۆمەڵناسانەكانەوە كە پێشتر باسكرا سەرچاوە ناگرێت. بە وتەیەكیتر وانیە كە گۆیا تەنیا مرۆڤە رازی و داراكان دەتوانن لە فەرهەنگ بەهرەمەند بن. رێخستنی

دووبــارە ئــابووری پێویســتیەکی حەتمییــە چــونکە بــەهۆی پێکهاتــەی بێهاوتای وشـیاری مـرۆڤ، شـەڕ و خراپـە و چەرمەسـەرییە کاتییـەکان... ڕێگەی پرسە ئامانجدارەکان دەگرن. ئەڵبەت ئـەم خراپـە و چەرمەسـەرییە کاتییانە بەتەنیایی ناتوانن پرسە ئایدیالەکانی دنیا بـە وشـیاری بگەیـەنن. دەکرێ ئـەم خاڵـە بـە نموونەیـەکی هـەرە سـادە روون بکەینـەوە: کەسـێ بێننە پـێش چـاوتان کـە مێشـکی خـۆی بـۆ پرسـێکی ئـاڵۆزی زانسـتی بـە خەستی شەکەت دەکات، لە هەمان کاتـدا تووشـی دان ئێشـەیەکی قـورس دەبێت، ڕۆشنە کە وەها کەسێك زۆرجـار ناتوانـێ بـە باشـی بیربکاتـەوە و درێژە بە کارەکەی بدات مەگەر ئـەوە کـە ژانـی دیانەکـەی هـەتوان بکـات. روخانی بورژوازی و ژیاندنەوەی سۆسیالیستی نوێی ئابووری یانی هـەتوان کرانی هەموو دان ئێشەکانی مرۆڤایەتی، هـەر بـەوجورەی کـە هـەموو ئـەو شتانەی کە لەئاست پرسە بنەرەتیەکان پیش بە مرۆڤ دەگرن بەم چەشـنە لە وشیاری مرۆڤ پاك دەبنەوە، ئێستە دەرگاکانی وشیاری بە رووی پرسـی سەرەکیدا دەکرێنەوە. نموونـەی ئێمـە ئاسـتەنگەکانی گـۆڕینی ئـابووریش پیشـان ئـەدات. ئاشـکرایە کـە دان ئیشـە دەبـێ هـەتوان بکـرێ تـا مێشـك بتوانێ دەس بەکار بێت. بـەلام ئـەم خاڵـەش ئاشـکرایە کـە ئـەم کـارە بـە لەنێوچوونی ئوتوماتیکی ژان و ئازار دەس پێناکات، بەڵکوو بۆ ئـەم کـارە خرۆش و فوارەی نوێی وزە و تواناییەکان، میشکی نوێ و شوور و شـەوق و گەشە و نشاتی نوێ پێویستە. تەنانەت ئەو کاتەش کـە هـەموو رەنـج و ئـازاری ئــابووری لــەنێو چــووبێت، هێشــتا خــەڵکی زەحمــەتکیش بــە ئامانجەکانی خۆیان نەگەیشتوون. بەڵکوو مرۆڤ تەنیا دەرفـەتی دەسـپێکی

بـزاوتن بـەرەو ئامانجـە واقعیـەكانی خـۆی بـە هێـز و توانـانی تـازەوە خولقاندوە. لەم حاڵەتەدا فەرهەنگ بریتیە لـە فـۆرمی ئایـدیالی مرۆڤبـوونی مرۆڤ. لەم روەوەیە كە فەرهەنگ بە دەست مرۆڤەكان دەخولقێت نە بەپێی بـارودۆخی دەرەكـی. كـەوابوو هەرچەشـنە گـۆڕینی كۆمـەڵگا بـە مانـای چوارچـێوە و دەرفــەتی خودموختــاری و داهێنــەریی خۆڕســكی مرۆڤــی ئازادە.

بەمهۆیە توێژینەوەی كۆمەڵناسانە دەبێ تایبەت بە شرۆڤەی قەوارە و چوارچێوە بێت. ئەمە كە فەرهـەنگی كۆمـەڵگای كرێكـاری چـی دەبێـت – یانی بەشێوەی خۆرسك چـی دەبێـت، یـان لـە بنەڕەتـدا چـۆن پێكـدێت – تەنیا هێزە كرێكارییە رزگار بووەكـان دیـاری دەكـەن. لـەم بابەتـەوە هـەر كۆششێك بیەوێت لە پێشدا شتێ بڵێـت دەبێتـە مایـەی پێكـەنین و گاڵتـە. شرۆڤەی كۆمەڵناسانە تەنیا دەتوانێ پیشان بدات كە ئەم دەرفەتە بەهۆی كۆمەڵگـەی كرێكـاری پێكـدێت و كۆمەڵگـە كرێكـاری تـەنیا ئـەم دەرفەتـە دەڕەخسـێنێت. پاژەكـان زیـاتر لـە دەرەوەی قەوارەیـەكن كـە رێگـا و مێتۆدی تۆژینەوەی زانستی ئێستە ئاراستەی دەكەن. كەوابوو لە باشـترین حاڵەتدا تەنیا دەتوانین باسی ئەو بەشە لە بەها فەرهەنگیەكانی كۆمەڵگای كۆن بكەین كە رەنگە لەگەڵ خەسڵەتی چوارچێوەی نوێ سازگار بن و لەم رووەوە دەكرێ ئەوە قەبووڵ بكەین بـۆ گەشـە و پەرەپێـدانی تێبكۆشـین. بۆ نموونە بۆچوونێك لە مرۆڤ وەك ئامـانجێكی گەوهـەریی – یـانی بناغـەی فەرهـەنگی نـوێ – میراتـی ئایـدیالیزمی كلاسـیكی سـەدەی نۆزدەهەمـە. بەشی واقعی سەردەمی سەرمایەداری لـە پێكهاتـەی داهـاتوودا بریتیـە لـە

پێکهێنـانی زەمینـە و دەرفـەتی روخـانی خـۆی. سـەرمایەداری تەنانـەت لەسـەر وێرانـەکانی خۆشـی چـەندین دەرفـەت و ماتریـاڵ بـۆ پێکهاتـەی داهـاتوو پێکـدێنێ. هـەر بـەوجۆرەی کـە سـەرمایەداری پێشـمەرجە ئابوورییەکانی روخانی خـۆی فەراهـەم دەکا و چـەندین چـەکی فکـری بـۆ رەخنەی کرێکاری دەستەبەر دەکات کە یارمەتی بە روخانی خۆی دەکات (بۆ نموونە پێوەندی مارکس لەگـەڵ ریکـاردۆ) هـەروا لـە فەلسەفەشـدا لـە کانتەوە تا هێگل ئەندێشەی کۆمەڵگایەکی نوێی خولقاندووە کە ئەرکی ئەو ئەمەیە کە دەرفەتی روخانی سەرمایەداری فەراهەم بکات.

سەرچاوە:

نویسندە، نقد و فرهنگ- جورج لوکاچ: اکبر معصوم بیگی، ص 257- 279، نشر دیگر.

## ژێدەر و سەرچاوەکان:

1. Danecki J.: *Jednosc podzielonego czasu* . (L'unité du temps divisé). Varsovie, 1970.

2. Zweig F.: *The worker in affluent society* . (L'ouvrier dans la société d'abondance). Londres, p. 253.

3. DANECKI: *op. cit*., p. 272.

4. SZANTO M.I.: *Szabad szombat és életmodvaltozasok* . (Le long weekend et ses conséquences sur la façon de vivre). Budapest, 1971, manuscrit.

5. MARX K.: *Theorien uber den Mehrwert* . Vol. III. Berlin, 1962, Dietz Verlag, pp. 245-255.

6. HEGEDUS A. - MARKUS M.: *The role of values in the long range planning of distribution and consumption* . (Le role des critères dans la planification de la distribution et de la consommation). In HALMOS (éd.) The Sociological Review Monograph 17. Hungarian Sociological Studies. Keele. 1972. Université de Keele.

7. WEBER M.: *Gardasàg és tàrsadalom* . (L'économie et la soeiété). Budapest, 1967. Közgazdasàgi és Jogi Könyvkiado, p. 304.

8. *Ibid*., p. 322.

9. ZWEIG, *op. cit*., p. 70-75.

10. MARKUS M. - HEGEDUS A.: *Gemeinschaft und Individuum* . (La communauté et l'individu). Wiener Tagebuch, 19721.

11. JOZSA O.: *Oktatàs, szakképzés, gazdasàg* . (Le système d'enseignement, la formation spécialisée et l'économie). Budapest, 1969. Közgazdasàgi és Jogi Könyvkiado, p. 62.

12. HAVAS O.: *Szakképzési kutatàsok I* . (Recherche sur la formation technique I.). Budapest, 1970. Ministère du Travail.

13. *Ibid*., p. 41.